# بەستانداردکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی

د. ڕەفیق سابیر




لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ٢٩

# بەستانداردکردنی زمان و ئەلفوبێی کوردی

لێکۆڵینەوە

**د. ڕەفیق سابیر**

- بەرگ: ئازاد سوورخی
- چاپ: دووەم- ٢٠١٤
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠ هەزار دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ٢٨٧ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

# پێڕست

⇐ **بوون (وجود) هۆنراوەی خوایە. خوا شاعیرە و لەرێی زمانەوە گەردوونی خوڵقاندووە. خوا بە گەردوونی وت: ببە! گەردوونیش بوو.**

یۆهان هامان

١٧٨٥ - ١٧٣٠

⇐ **مرۆڤ نیشتەجێی زمانە، نەک وڵات.**

ئێمیل سیۆران

## پێشباس

مرۆڤ تەنیا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو دیاردەیەکی زمانییشە. کەسایەتیی مرۆڤ، شێوەی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی لە جیهانی دەوروبەری و رادەی رووناکبیری، پێش هەر شتێک، لە زمانەکەیدا دەردەکەون.

زمان بۆ گرووپ و نەتەوەیش دەتوانێت بە هەمان شێوە بێت، ئاستی فیکر و ئاوەز و شارستانەتی و تایبەتمەندییە کولتووری، ئێتنیکی و نەتەوەییەکانییان پیشان بدات.

کورد نەتەوەیەکی زمانییە. پێناسە (ئایدێنتیتی)ی ئێتنیکی و نەتەوەیی کورد لە زمانەکەیدا چڕبۆتەوە. کوردبوون دیارە بە مانا کولتووری و ئێتنیکییەکەی، پێش هەر شتێک، لە زماندا و لە رێگەی زمانەوە خۆی دەردەبڕێت. کوردبوون، بەبێ زمانی کوردی، لەمەیش گرنگتر بەبێ زمانێکی هۆشدار و بە ئاگا لە بارەی خۆیەوە، تایبەتمەندیی کولتووری و ناوەڕۆکی ئێتنیکی نەتەوەیی خۆی بزر دەکات.

زمانی کوردی، لە خاک زیاتر، بوونی بەجیاهەڵکەوتووی نەتەوەی کوردی پاراستووە. ئەگەر کورد زمانەکەی لەدەست بدایە و تەنانەت وەک ئێستا لە سەر خاک و زێدی خۆی بمایەتەوە، ئەوا لەمێژ بوو لە نێو نەتەوە سەردەستەکانی تورک، فارس و عەرەبدا توابۆوە. چونکە کورد جگە لە زمان هیچ فاکتەرێکی دیکەی کولتووری

(ئاین) یان بایۆلۆجی (ڕەنگی پێست و فۆرمی ڕوخسار) لەو نەتەوانە جیای ناکاتەوە. کەچی زمان دەشێت، بۆ هەندێک گەل و نەتەوەی تر بەو جۆرە نەبێت، بەڵکو زمان تەنیا توخمێکی کولتووریی بێت، لە جیاتییان فاکتەرێکی دیکەی کولتووری (ئاین، مەزهەب) یان ڕابردووی مێژوویی، ئەو ڕۆڵە بنەڕەتییەی، لە پێکهێنانی پێناسە و چارەنووسی نەتەوەکەدا هەبێت.

ئەو نەتەوانەی دوای پەلاماری عەرەب، بۆ سەر ناوچەکانیان، لەناوچوون و بە عەرەب کران، لەبەر ئەوە نەبوو کە خاکی خۆیان لەدەست دا، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کولتوور و زمانەکەیان نەیانتوانی بەرگەی پەلاماری کولتوور و زمانی عەرەبی بگرن. شەڕی عەرەب لە دژی کولتوور و زمانانی دی، ئەگەر یەکەمین شەڕی کولتوور و زمانەکان نەبووبێت لە جیهاندا، ئەوا بە دڵنیاییەوە سامناکترین و کاریگەرترینیان بووە. عەرەب بە نێوی ئاینەوە (پیرۆزی) بە زمان و کولتووری خۆی، کە لە بنەڕەتدا زمان و کولتوورێکی بەدەوییانە بوون، بەخشی. لە ڕێی سەپاندنی زمان و کولتووری عەرەبییشەوە چەندان کولتوور و زمانی گەلانی تری (ئێرانی، ئیگیپتی ـقیبتی ـ ئەمازیغی، فینیقی..تاد) لەنێو برد. کورد لەم شەڕەدا، بە هۆی زمانەکەیەوە، توانی پارێزگاریی لە بوون و مانەوەی خۆی بکات.

لەبەر ئەوەی زمان گرنگترین فاکتەری مانەوەی کورد بووە، شەڕی کورد لە پێناوی مانەوەدا، پێش هەر شتێک، شەڕی زمان بووە. داگیرکەرانی کوردستان، بەردەوام هەوڵی کوشتنی زمانی کوردییان داوە. ئەوان نوێنەری کولتوورێکی فاناتیکانە و ئایدیۆلۆجیایەکی شۆڤێنیستی بوون و باوەڕیان بە ئازادی (ئەویدی) نەبووە، ڕێزێکیان بۆ ئاین و مەزهەب و زمان و کولتووری خەڵکی تر

دانەناوە. لە بەرامبەر ئەو شەڕ و پەلامارانەدا، زمانی کوردی بەردەوام لە حاڵەتی خۆپاراستن و داکۆکی لەخۆکردندا بووە و سەدان ساڵ، پێش ئەوەی ببێتە زمانی نووسین، یان زمانی ئەدەبی، وەک کۆمەڵێک دیالێکت (لەهجە) لە ئاخاوتندا ماوەتەوە و گەشەی کردووە.

کورد نزیکەی سەدەیەکە بەسەر چوار کۆمەڵ (کۆمەڵگا) و وڵاتی خاوەن سێ زمان و کولتووری جیاوازدا دابەشکراوە. داگیرکردن و دابەشکردنی نەتەوەیی و جیۆگرافیی، بە درێژایی دەیان ساڵ، جیاوازیی قووڵی کولتووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و سایکۆلۆجی لە نێوان بەشەکانی کوردستاندا پێک هێناوە. لەبەر ئەوەی کورد نەتەوەیەکی زمانییە، سەیر نییە کە جیاوازییەکان، پێش هەر شتێک، لە زمانەکەیدا دەربکەون، یان زمانی کوردی خۆی بووبێتە فاکتەرێکی تری دابەشبوون و لێکدابڕانی کولتووری و سیاسیی کورد.

زمانی کوردی، لە هەر بەشێکی کوردستاندا، لە رووی رستەبەندی و وشەسازی و واتاسازییەوە لە ژێر کارتێکردنی زمانی نەتەوەی سەردەست دایە. لەبەر ئەوەی ئەم کارتێکردنە لە سێ زمانی سەر بە سێ سیستەمی جیاوازی زمانەوە (عەرەبی، فارسی و تورکی) هاتووە، ئەنجامەکەی زۆر سەختتر بووە. چونکە بە هۆیەوە شێوەزمانی پەیڤین و نۆرمی نووسینی کوردی، لە باکوور و باشووری کوردستاندا، جیاوازییان زۆرتر بووە و لێک دوورتر کەوتوونەتەوە.

ئەم کتێبە لە باسێک و چوار دیدار، لەبارەی زمانی کوردی، پێک هاتووە. باسەکە دوو بەشە. بەشی یەکەم تایبەتە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی. مەبەست لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی ئەو زمانەیە کە دوو سەدەیە، لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا،

زمانی نووسین و ئەدەبیاتە. ئەم زمانە، لە رەوشی مێژوویی و سیاسی و کولتووریی کورددا، بە جۆرێکی سروشتی دەرکەوتووە، گەشەی کردووە و خۆی چەسپاندووە. نزیکەی سەدەیەکیشە زمانی خوێندن و نووسین و رۆژنامەوانی و زانست و زانین و زمانی سیاسەت و هەر حوکمڕانی و حکومەتێک بووە، کە گەلی کورد لە باشوور و رۆژهەلاتی کوردستاندا، دای مەزراندوون. بە کردەوەیش رۆلی تەواوی زمانی ستانداردی گێراوە و دەگێرێت.

لە پاڵ ئەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەدا، لە ئەدەبیات و نووسینی کوردیدا شیوەزمان و دیالێکتی تریش، کوردیی سەروو (کرمانجی) بادینانی و زازا، بەکار دەهێندرێن. ئایا ئەم دیاردەیە، کە لە دنیادا نموونەی نییە، تا چەند کار لە یەکبوونی زمانی کوردی و یەکبوونی کولتووری و نەتەوەیی کورد دەکات؟

ئایا زمانی کوردی، بە راستی یەک زمانە، یان بەرەو چەند زمانێک دەڕوات؟ ئەگەر یەک زمانە بە چەندان دیالێکتەوە، جیاوازیی نێوان دیالێکت و زمان چییە؟ ئایا دیالێکت دەتوانێت پرەستیژ (پلە و ئیعتیبار)ی زمانی هەبێت و داوای بە ستانداربوون بکات؟

لەم باسەدا هەوڵ دراوە ئەم مەسەلانە باس بکرێن، هۆکارە سیاسی و کولتوورییەکان و ئەنجامەکانیان روون بکرێنەوە. هەروا ئاماژە بە ئەزموونی چەندان نەتەوەی دی، لە بواری پێکهاتنی زمانی ئەدەبی و بەستانداردکردنی زمان و کێشەی نێوان زمانی ستاندارد و دیالێکتەکان، دراوە.

بەلام بەشی دووەمی باسەکە بۆ ئەلفوبێی کوردی تەرخان کراوە، کە چوار سەدە زیاترە، لەگەڵ پەیدابوونی نووسینی کوردیدا، دەرکەوتووە. بەلام لە دوای پێکهێنانی دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک، لە

ساڵی ١٩٢٤ دا ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بە سەر گەلانی نێو تورکیا (لەوانە بە سەر کورد) داسەپێندراوە. بە هۆی سەپاندنی ئەم ئەلفوبێ نوێیەوە، کوردی باکووری کوردستان نەک هەر لە ڕیشەی مێژوویی و ڕابردوویان دابڕاون، بەڵکو تا ئەمرۆیش، لە هەر پەیوەندی و کارتێکردنێکی ئەدەبی، کولتووری، فیکری و سیاسیی بەشەکانی تری کوردستان بە دوور ماونەتەوە.

هەروا لەم باسەدا گرنگی بوون و پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی زمانی، لە باشووری کوردستاندا، پێشنیار کراوە. بەو ئامانجەی زمانی کوردی، لە ئاژاوە و پاشاگەردانی دەرباز بکرێت، لە ڕێی یاسا و دەزگای تایبەتی زمانییەوە بپارێزرێت. دیاردەی فرە دیالێکتی، لە جیاتی ئەوەی بەرەو جیاوازی و لێکدابڕانی کولتووری و نەتەوەییمان بەرێت، بکرێتە مایەی دەوڵەمەندیی کولتووری و یەکبوونی نەتەوەییمان بەهێز بکات.

دواجار دەبێ ئاماژە بدەم کە ئەم باسە لە ساڵی ٢٠٠٨ وەک نامیلکەیەک بە ناوی (بەستانداردکردنی زمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی) لە لایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە بڵاو کرایەوە. لەم چاپە نوێیەدا چەند چاوپێکەوتنێک، وەک پاشبەند، زیاد کراوە. چاوپێکەوتنەکان تایبەتن بە زمان و ئەلفوبێی کوردی، بۆیە دەکرێت، لە هەندێک لایەنەوە، بە تەواوکاری باسەکە دابندرێن.

# زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو

هەر زمانێک لە کۆمەڵێک دیالێکت پێک هاتووە. زمان و دیالێکت، لە رووی زانستی زمانەوە جیاوازییەکی گەورەیان لە نێواندا نییە. هەر دیالێکتێک لە رێی پێنووسین و نووسینەوەی رێزمانەکەی و دانانی فەرهەنگەوە، دەشێت لە ئەنجامدا پایە ئیعتیبار (پرەستیژ)ی زمان پەیدا بکات و ببێتە زمان، یان رۆڵی زمان ببینێت. بەڵام گۆڕینی دیالێکتێک بۆ زمانێکی سەربەخۆ، لە بنەڕەتدا، مەسەلەیەکی سیاسییە. بڕیاری سیاسی دەتوانێت دیالێکتی زمان، کە هیچ جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ زمانەکەدا نییە، بگۆڕێت بە زمانێکی سەربەخۆ، وەک دواتر بە نموونەوە باس دەکرێت.

زمانی ئەدەبی، وەک دیاردەیەکی نوێی کولتووری-زمانی، لە بنەڕەتدا لە دیالێکتێک، یان چەند دیالێکتێکی زمان پێک دێت. ئەم دیاردەیە، کە لە سەردەمێکی دیاریکراوی مێژووی گەلێکدا دەردەکەوێت، بە سەرەتای سەردەمێکی نوێی سیاسی و کولتووری دادەندرێت. لەو سەردەمەدا زمانی نەتەوە لە زمانی ئاخاوتن و پەیڤینەوە دەگۆڕدرێت بۆ زمانی نووسینیش. لێرەوە زمان (دواتر نەتەوە) هۆشیاری لە بارەی خۆیەوە پەیدا دەکات و لە زمانێک (نەتەوەیەک) لە خۆیدا، دەگۆڕدرێت بە زمانێک (نەتەوەیەک) بۆ خۆی.

زمان لە حاڵەتی پاسیڤیی خۆی دەردەچێت و دەبێتە فاکتەرێکی چالاک، کە بە هۆیەوە کولتووری هاوبەشی نەتەوە، خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی خۆی پیشان دەدات. پەیوەندیی نوێ لە نێوان بەش و ناوچەکانی وڵاتدا دەردەکەوێت. سەرەنجام زەمینەی لێک تێگەیشتن و هەستی هاوزمانی، هاوکولتووری، هاوخاکی و هاوچارەنووسی لە نێو ئەندامانی نەتەوەکەدا، کە سەر بە دیالێکتی جیاوازن، پێک دێت. ئەمەیش بە نۆرەی خۆی زەمینەی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی هۆشیاری و هاوئاهەنگی (ئینتێگراسیۆن)ی نەتەوەیی ئامادە دەکات.

زمانی ئەدەبی (هەروا هۆشیاری نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم) لە هەر وڵاتێکدا، سەرەتا لە ناوچەیەکی وڵاتەکەدا پەیدا دەبێت، دواتر لە ناوچەکانی دیکەی وڵاتدا بڵاو دەبێتەوە. بۆیە ئەو زمانە ئەدەبییە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی دیالێکتێک، یان چەند دیالێکتێکی ئەو ناوچەیەی کە تیایدا دەرکەوتووە، بەخۆ دەگرێت. بەڵام دواتر، لەگەڵ گەشەکردن و پەلهاویشتنیدا، لە لایەکەوە جێگای خۆی لە نێو دیالێکتەکانی دیکەی زمانەکەدا دەکاتەوە، لە لایەکی دیکەوە بەو دیالێکتانە متوربە دەبێت. بە جۆرێکی سروشتی کۆمەڵێک تایبەتمەندیی ئەو دیالێکتانە، بە تایبەتی لە رووی دەنگسازی (فۆنۆلۆجی) و واتاسازی (لێکسیکۆلۆجی) و وشەسازی (مۆرفۆلۆجی) ئاوێتەی خۆی دەکات. کەواتا زمانی ئەدەبی، لە هەر ناوچەیەکی وڵاتدا و لە سەر بنەمای هەر دیالێکتێکی زمانەکە پەیدا ببێت، لە پرۆسێس‌ی بوونی بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا، رەنگ و مۆرکی تێکڕای زمانی نەتەوە و زۆربەی دیالێکتەکانی دەگرێت.

ئەزموونی مێژوویی گەلان پیشانی دەدات کە پەیوەندیی راستەوخۆ لە نێوان پێکهاتنی زمانی ئەدەبی و دەرکەوتنی هۆشیاریی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزمدا هەیە. (بێنێدیکت ئەندێرسۆن) پێیوایە کە

زمانی ئەدەبیی، لە هەندێک وڵاتی ئەورووپادا، ڕێگەی بۆ دەرکەوتنی هۆشیاریی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆش کرد. بە بۆچوونی ئەو، زمانی ئەدەبیی ئۆکرانی سەرەتا ساڵی ١٨٠٤ لە ڕێگای شیعرەوە دەرکەوت. چل ساڵ دواتر یەکەمین ڕێکخراوی ناسیۆنالیستیی ئۆکرانی دامەزرێندرا، کە کەوتە خەبات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی. هەروا خەباتی گەلی هەنگاری (مەجەری) بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی بە گەڕانەوە بۆ زمانی خەڵک و پشتکردنە زمانی لاتینی، کە تا چلەکانی سەدەی نۆزدەیەم زمانی ستانداردی دەوڵەتی پروسی (نەمسا- هەنگاری) بوو، دەستی پێ کرد[1].

ناسیۆنالیزم لە ئەڵمانیادا، پێش هەر شتێک، وەک دیاردەیەکی کولتووری-زمانی دەرکەوت. هەندێک فەیلەسوف و بیرمەندی ئەڵمانی، لەوانە (هێردێر، فیختێ، شێلینگ) مەسەلەی دەوڵەتی نەتەوەییان بە مەسەلەی ئێتنیکی و کولتوورییەوە گرێ دا. بە ڕای ئەوان هەر گرووپێکی خەڵک، کە خاوەنی کەسایەتی و زمانی خۆی بێت، پێویستە دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیشی هەبێت. بە لای (هێردێر)ەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان تایبەتمەندیی زمان و تایبەتمەندیی نەتەوەدا هەیە. هەر نەتەوەیەک بەو جۆرەی دەدوێت بیر دەکاتەوە، بەو جۆرەیش بیر دەکاتەوە کە دەدوێت. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە سنووری دەوڵەت تا ئەو ناوچانە بێت کە نەتەوەکە تێیدا دەژی[2]. هەروەها (فیختێ) ڕای وا بوو کە سنووری سروشتیی دەوڵەت دەبێت لە سەر بنەمای زمان بێت[3]. واتا ئەوانەی بە زمانێک دەدوێن لەنێو سنووری دەوڵەتێکدا پێکەوە بژین.

لە سەدەی حەڤدەیەمەوە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو (زمانی نەتەوەیی) لە نێو گەلانی ڕۆژئاوای ئەورووپادا، لە پێشبڕکێ لەگەڵ

یەکتری و لەگەڵ زمانی لاتینیدا دەرکەوت. ئەم دیاردەیە لە لایەکەوە سەرەتایەکی بۆ دامەزراندن، یا چەسپاندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، لە هەر وڵاتێکی رۆژئاوای ئەوروپادا، پێک هێنا. لە لایەکی دیکەشەوە پاشەکشەی تەواوی بە زمانی لاتینی کرد، کە زمانی کڵێسا و دەسەڵات وزانست و زانین و زمانی هاوبەشی خوێندەوار و رووناکبیران بوو.

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو سەرەتا، لە بەرامبەر لاتینیدا، بە زمانی خەڵک، یان زمانی گەل ناو دەبرا. بەڵام راستییەکەی دەسەڵاتداران، نەک خەڵک، برەویان بەم زمانە دا و وەک زمانی نووسین و زمانی سیستمی خوێندن بڵاویان کردەوە. ئەم زمانە نوێیە، لە هەر وڵاتێکدا، لە نێو خەڵکدا لە زمانی لاتینی ناسراوتر بوو، چونکە پشتی بەو زمانە بەستبوو کە خەڵک بە گشتی پێی دەدوان. بەڵام فۆرمی ستانداردی زمانی فرەنسایی، ئینگلیزی یان سوێدی لە کۆی هاوبەشی زمانی خەڵکەوە نەهاتبوو، بەڵکو ئەو زمانە بوو کە لە دەرباری پاشاکاندا و لای چینی سەرەوە بەکار دەهات.(٤). بۆیە ئەو زمانە سەرەتا لەلای زۆرینەی خەڵک، کە بە دیالێکتی ناوچەیی خۆیان دەدوان، زانراو نەبووە. بەڵام دواتر لەگەڵ سەقامگیربوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و بڵاوبوونەوەی سیستمی خوێندن و قوتابخانە و دەرکەوتنی چاپەمەنیدا، زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، وەک زمانی ستاندارد و دەوڵەت، بە فراوانی لە ناو خەڵک و تەواوی ناوچەکانی وڵاتدا بڵاو کرایەوە و چەسپێندرا.

پرۆسێسی پێکهاتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و بەستانداردکردنی، لە زۆربەی وڵاتاندا، شانبەشانی دروستکردنی نەتەوە و چەسپاندنی دەوڵەتی نەتەوەیی و دەزگاکانی رۆیشتووە. ئەم پرۆسێسە، لە هەندێک وڵاتدا، دەیان ساڵی خایاندووە. بۆ نموونە لە ساڵی١٧٩٠دا تەنیا لەسەدا دەی خەڵکی فرەنسا زمانی ستانداردی

فرەنسییان زانیوە. دواتر لە ساڵی ١٨٧٢دا هێشتا زیاتر لە چواریەکی هاووڵاتییانی فرەنسا لە زمانی ستانداردی فرەنسیی نەگەیشتوون[٥].

بۆیە پێکهاتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و بە ستانداردکردنی، پەیوەندیی بە زۆری و کەمی ژمارەی ئەو کەسانەوە نییە کە بەو زمانە دەدوێن، بەڵکوو لە بنەڕەتدا پەیوەندیی بەو رۆڵە مێژووییەوە هەیە کە ئەو زمانە لە ژیانی کولتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی نەتەوەدا بینیویەتی و دەیبینێت.

## له زمانی ئەدەبیی یەکگرتووەوە
## بەرەو زمانی ستاندارد

زمانی ستاندارد له ناوەرۆکدا زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە لە فۆرمیکی سیاسی-یاساییدا. زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، کە لە سەردەمێکی مێژوویی ژیانی نەتەوەدا پێک دێت، لە پرۆسێسی بەرەوپێشچوون و بڵاوبوونەوەیدا، بنچینەی هاوبەشی پێکەوەهەڵکردن و هاوئاهەنگی (ئینتێگراسیۆن)ی نەتەوەیی دادەڕێژێت و رەوایی ستانداردبوونی خۆی دەسەلمێنێت. سەرەنجام بەرەو ئاسۆی بەستانداردبوون دەچێت. ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە، لە هەندێک وڵاتدا، بە بڕیاری دەوڵەت کراوە بە زمانی ستاندارد و چەسپێندراوە. لە هەندێک وڵاتی تردا زمانەکە خۆی، پێش دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی و بە هۆی ئەو رۆڵە گرنگە ئەدەبی و فیکری و سیاسییەی لە ژیانی نەتەوەدا بوویەتی، ستاتووسی زمانی ستانداردی پەیدا کردووە. دواتریش، واتا دوای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، بە بڕیاری سیاسی سروشتی رەسمیی زمانی ستانداردی پێدراوە، قانوون و دەزگای تایبەت بۆ پاراستن و گەشەپێدانی دامەزرێندراون. بۆ نموونە زمانی نوێی فارسی، سەرەتا لە سەدەی دەیەمدا، دەرکەوت و بە جۆرێک بڵاو بۆوە، کە لە سەدەی دوازدەیەم و سێزدەیەمدا، لە ئاسیای بچووکەوە تا هیندستان، زمانی ئەدەبیات بوو[٦]

کاتێک سەفەوییەکان، کە تورکزمان بوون، لە ساڵی ١٥٠١ دا، دەوڵەتی ئێرانیان دامەزراند، سەرەتا زمانی ئازەری و دواتر زمانی ئەدەبیی فارسییان کردە زمانی ستانداردی دەوڵەتەکەیان. کەچی تورکە سەفەوییەکان و زۆرینەی خەڵکی نەخوێندەواری فارس بەو زمانە ئەدەبییە ئاشنا نەبوون.

زمانی عیبریی نوێ نموونەیەکی دیکەی بەستانداردکردنی زمانی ئەدەبیی یەککگرتوو، دوای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، پیشان دەدات. زمانی عیبریی نوێ، وەک زمانی ئەدەبی، لەسەر بنەمای زمانی کۆنی عیبری، بە کۆششی ناسیۆنالیستانی جوو لە مەنفا (ئێکسیل) پێک هات. کاتێک لە ساڵی ١٩٤٨ دادەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرێندرا، هەر لە سەرەتاوە زمانی ئەدەبیی عیبریی کرا بە زمانی ستانداردی وڵات. زۆرینەی ئەو جوولەکانەی دواتر، لە دەیان وڵاتانی دنیاوە، بە کوردستانیشەوە، روویان لە ئیسرائیل کرد، بەو زمانە ئاشنا نەبوون. بەڵام لە ریگای دەزگاکانی خوێندن و دەزگاکانی تری دەوڵەت و میدیاوە، فێری زمانەکە کران. ئاشکرایە ئاین، نەک زمان، ناوەرۆکی پێناسەی نەتەوەی جوو پێک دێنێت. ئەگەر دەوڵەتی ئیسرائیل، لە جیاتی زمانی عیبری، هەر زمانێکی دی (بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی) بکردایە بە زمانی ستاندارد، گەلی جوو و دەوڵەتی ئیسرائیل، بە هۆی ئاینەکەیانەوە، پێناسە (ئایدینتیت)ی نەتەوەیی خۆیان دەپاراست. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا مەسەلەی زمان و زمانی ستاندارد، لای ئەوان، بە مەسەلەیەکی نەتەوەیی هێندە گرنگ و چارەنووسساز داندرا.

ستانداردکردنی زمانی تورکی، لەگەڵ هەموو خەوشەکانیدا، نموویەکی ترە، کە خراپ نییە لێرەدا، زۆر بە کورتی، باسی بکەین.

ناسیۆنالیزمی تورک، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای

سەدەی بیستەمدا، وەک هێزێکی نوێی سیاسی لە ئەستەنبوول و هەندێک ناوچەی تری تورکیادا دەرکەوت. ناسیۆنالیزمی تورک دەیویست، لە پاڵ ریفۆرمی سیاسی و دەستووریدا، ئایدیۆلۆجیای ئاینیی دەوڵەتی عوسمانی بگۆڕێت بە ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیستی تورک. دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، ئیمپراتۆریای عوسمانی تێک شکێندرا و لەسەر کەلاوە و لە پاشماوەکەی، دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک دامەزرێندرا. لەگەڵ ئەم وەرچەرخانەدا، ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتی تورک لە ئاینییەوە گۆڕدرا بە ناسیۆنالیزم و پانتورکیزم، یان تورکیزم کرا بە ئاینی نوێی دەوڵەتی تورکیا. بۆیە تورکبوون، لە جیاتی موسوڵمانبوون، لە دەوڵەتی نوێی تورکیادا، کرایە بنچینەی هاووڵاتیبوون. زمانی نوێی تورکی، کە لە بنچینەدا دیالێکتی ئەستەنبوول بوو، کرایە زمانی ستانداردی دەوڵەتی تورکی و جێگای زمانی تورکیی عوسمانیی گرتەوە. سەپاندنی زمانی نوێی تورکی، شانبەشانی پرۆسێسی دروستکردنی نەتەوەی تورک دەستی پێکرد. دەوڵەت لەپرۆسێسی گۆڕینی دیالێکتی ئەستەمبوڵی بۆ زمانی ستانداردی تورکی و سەپاندن و چەسپاندنیدا، ئەلفوبێی لاتینی لە جێی ئەلفوبێی تورکیی عوسمانیدا (عەرەبی-فارسی-کوردی) سەپاند و زمانی هەموو گەلانی تری تورکیای یاساغ کرد. بەپێی مادەی دووەمی دەستووری ساڵی ١٩٢٤زمانی تورکی و نەتەوەی تورک کران بە تاکە زمان و تاکە نەتەوەی دانپێدانراوی تورکیا [٧]. بۆ سەرکەوتنی ئەم سیاسەتە زمانییە- نەتەوەییە دەبوو، لە پاڵ تۆقاندن و کوشتنی بە کۆمەڵدا، گەلانی تورکیا لە ریشەی کولتووریی خۆیان داببڕدرێن و نەتەوەیەکی نوێی تورکی، بەو جۆرەی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم دەی خواست، دروست کرێت. سەپاندنی زمانی نوێی تورکی و ئەلفوبێی لاتینی (لەگەڵ یاساخکردنی نووسین بە ئەلفوبێی عەرەبی-توکی-کوردی) بەشێکی گرنگی ئەم سیاسەتە زمانییە- نەتەوەییە و

ئامرازێکی سەرکەوتنیشی بوون.

دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک، لە ڕێی زمانی نوێی تورکییەوە، کەوتە بەتورککردنی خەڵکانێک کە بە تەواوی لە ڕابردووی کولتووری و ڕووناکبیری و تەنانەت لە زمانی خۆیان دابڕابوون. لەم دۆخە سەختەدا ئەلفوبێی لاتینی-تورکی، لە پرۆسێسی یاساخکردن و کوشتنی زمانی کوردیدا، بەسەر کوردی باکووری کوردستانیشدا سەپێندرا و پیرۆز کرا.

زمانی ستاندارد، لە ڕەوشی پەلهاویشتن و بڵاوبوونەوەیدا، دەبێتە زمانی هاوبەشی نەتەوە و دەوڵەت. بەڵام دیالێکتەکان، بە هۆی بڵاوبوونەوەی زمانەکەوە و ئەنجامەکانییەوە، لەناو ناچن. زۆربەی دیالێکتەکان، لە پاڵ زمانی ستانداردا، بە شێوازی زیندووی جۆراوجۆر لە پەیڤین و ئەدەب و هونەر و دیاردەی دیکەی کولتووریدا، بەردەوام دەبن و گەشە دەکەن.

پێش هەزار و چوارسەد ساڵێک زمانی قورئان، کە لە بنەڕەتدا دیالێکتی قورەیش بوو، وەک زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی عەرەب دەرکەوت و دواتریش کرا بە زمانی ستانداردی هەموو وڵاتانی ناونراو بە عەرەبی. کەچی دیالێکتەکانی زمانی عەرەبی هێشتا لەو وڵاتانەدا درێژە بە خۆیان دەدەن. ساڵانە بە سەدان فیلم، گۆرانی، کۆمەڵەشیعر و شانۆنامە بەو دیالێکتانەی زمانی عەرەبی (بە تایبەتی لەهجەی میسری، لوبنانی، عێراقی، سودانی..تاد) دەهێندرێنە بەرهەم. ڕاستییەکەی ئەو دیالێکتانە، کە زۆر لە زمانی ستانداردی عەرەب جیاوازن، شانبەشانی زمانی ستانداردی عەرەبی لە پێشبڕکێ دان. لە پەیڤین و نووسینی ئەدەبی و هونەریدا بەردەوامن، بەو بەرهەمانەیش ژیانی ئەدەبی و هونەریی ئەو وڵاتانە دەوڵەمەند دەکەن. هەندێک لەو

دیالێکتانه (به تایبەتی دیالێکتی میسری و تا رادەیەک دیالێکتی لوبنانی) به هۆی گرنگی ئەو بابەته هونەری و ئەدەبییانەی پێیان دەهێندرێنه بەرهەم، هێنده له نێو گەلانی عەرەبدا زانراون، که وەک زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی عەرەبی خەڵک تێیان دەگات. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا ئەم دوو دیالێکته نەیان توانیوه، تەنانەت له وڵاتەکەی خۆیشیاندا، جێگای زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی عەرەبی بگرنەوه و ببن به زمانی ستاندارد، واتا زمانی دەوڵەت و دەزگاکانی. هەروا به بیری هیچ کام له گەلی میسر و لوبنان یان گەلانی تری وڵاتانی عەرەبیدا نەهاتووه که داوا بکەن دیالێکتەکانیان، لەبەر ئەوەی له وڵاتەکانیاندا زانراون، جێگای زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و زمانی ستاندارد بگرنەوه. یان بکرێن به زمانی خوێندن له و وڵاتانەدا، بەو بیانووەی که منداڵان له زمانی ستاندارد ناگەن و له ماڵەوه لەگەڵ دایک و باوکیاندا به دیالێکتی وڵاتەکەیان دەدوێن. چونکه کاریکی لەم جۆره دەتوانێت زمانی عەرەبی بکاته چەندان زمان.

هەر زمانێک، وەک وتمان، له چەندان دیالێکت پێک هاتووه. جیاوازی نێوان زمان و دیالێکت لەو رۆڵەدا دەر دەکەوێت که زمان، لەچاو دیالێکتدا، له ژیانی نەتەوەدا دەیبینێت. بۆیه زمان پرەستیژ و بایەخی له دیالێکت زیاتره. بەڵام هەر دیالێکتێک که دەبێت به زمان مەرج نییه زمانێکی پڕبەرهەم بێت، بەڵکو دەشێت زمانێکی نەزۆک بێت. له رووی زانستی زمانەوه سنوورێکی دیاریکراو له نێوان زمان و دیالێکتدا نییه. فاکتەری سیاسی، ئاینی و مەزهەبی، له هەر وڵاتێکدا، دەتوانێت به ئاسانی نەک هەر دیالێکتی زمانێک بگۆڕێت به زمانێکی سەربەخۆ، بەڵکو دەشێت تەنانەت نەتەوەیەکیش بکاته دوو نەتەوه، یان دوو گەلی جیاوازی خاوەن دوو قەوارەی سیاسیی سەربەخۆ. هەر کام له زمانانی گرووپی سکاندیناڤی، سلاڤی و جێرمانی ...تاد له

بنەڕەتدا یەک زمان بوون. زمانی سیربوکەرواتی، تا هەڵوەشانەوەی یۆگۆسلاڤیا لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی رابردوودا، زمانی هاوبەش و ستانداردی گەلانی سێرب، کەروات، بۆسنی و مۆنتینیگرییەکان بوو. بەڵام کاتێک سێرب و کەروات، کە یەکەمیان سەر بە مەزهەبی ئەرسەدۆکسە و دووەمیان سەر بە مەزهەبی کاتۆلیکە، بەشەڕ هاتن و کەرواتیا بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، زمانە هاوبەشەکەیشیان (سێربۆکەرواتی) بوو بە دوو زمانی سەربەخۆ، زمانی سێربی و زمانی کەرواتی. کاتێکیش بۆسنییەکان (کە گرووپێکی ئێتنیکیی سلاڤی- موسولمانن) لە دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیا جیابوونەوە، دیالێکتەکەی خۆیان ناونا (زمانی بۆسنی) و رایان گەیاند کە زمانی بۆسنی زمانێکی سەربەخۆیە و زمانی سلاڤە باشوورییە موسوڵمانەکانی تەواوی یۆگۆسلاڤیایە[٨].

زمانی مەکەدۆنی، تا چەند ساڵێک پێش ئێستا، بە دیالێکتێکی رۆژئاوای زمانیی بولگاری دادەندرا. کەچی ئەمڕۆ دەوڵەتێک و زمانێک بە نێوی مەکەدۆنیا هەن. راستییەکەی جیاوازیی نێوان ئەم زمانە نوێیە لەگەڵ زمانی بولگاریدا هێندە کەمە، کە بولگارێک و مەکەدۆنییەک، بەبێ هیچ گرفتێک، لەیەکتری دەگەن. زمانانی سکاندیناڤی نموونەیەکی تری دابەشبوونی زمانە. نووسەری سویدی (ئینگمار شۆهرمان) دەڵێت کە زۆرینەی خەڵکی سوید زۆر ئاسانتر لە زمانانی دراوسێ (واتا زمانانی دانمارکی، نەرویجی و ئایسلاندی) دەگەن تا لە هەندێک دیالێکتی سویدی، بۆ نموونە دیالێکتی ئێلڤ دالسمۆل، گۆتلەندی، یان یمتی[٩]. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دیالێکتانە بە زمان دانانرێن. نووسەرێکی تری سویدی (تۆری یانسۆن) دەنووسێت: (سویدییەکان و نەرویجییەکان دەتوانن زۆر بە باشی لە یەکتر بگەن، کەچی سویدی و نەرویجی بە دوو زمانی جیاواز دادەنرێن. لە لایەکی دیکەشەوە زۆرینەی سویدییەکان یەک

وشه لەو زمانە تێ ناگەن کە بە (ئێلڤ دالسمۆل) ناو دەبرێت و لە باکووری ناوچەی (دالەرنە) قسەی پێ دەکرێت، کەچی بە دیالێکتێکی زمانی سویدی دادەنرێت[١٠].

مۆلداڤیا و رۆمانیا نەتەوەیەک بوون و زمانەکەیشیان یەکە. دوای داگیرکردنی مۆلداڤیا لە لایەن رووسیاوە، رەوشی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتووریی مۆلداڤیا و رۆمانیا بە دوو ئاقاری جیاوازدا رۆیشتن. دوای ئازادبوونی مۆلداڤیا لە ژێردەستیی رووس، گەلی مۆلداڤیا لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ رۆمانیا یەک بگرێتەوە، سەربەخۆیی هەڵبژارد.

ئەڵمانیا لە رووی مێژوویی و کولتوورییەوە نەتەوەیەکی زمانییە و دەوڵەتی ناسیۆنالی ئەڵمان، لە سەر بنچینەی زمانی ئەڵمانی پێک هات. ئەڵمانیا و نەمسا دەکرا پێکەوە وەک نەتەوەیەک بژین، کەچی دوو گەل و دوو وڵاتی خاوەن یەک زمانن.

مرۆڤ ئەگەر بیەوێت درێژە بە باسەکە بدات دەتوانێت چەندان نموونەی دی بهێنێتەوە کە چۆن فاکتەری سیاسی توانیویەتی و دەتوانێت زمانێک و نەتەوەیەک بگۆڕێت بە چەند زمان و نەتەوەی سەربەخۆ، بێ ئەوەی هیچ جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان ئەو زمانانەدا هەبێت. فاکتەری سیاسی دەتوانێت، بە پێچەوانەیشەوە، کۆمەڵێک خەڵکی سەر بە دیالێکتی جیاوازی زمانێک، یان تەنانەت سەر بە چەند زمانێکی جیاواز، لە سایەی ئازادی و دیموکراسی و پاراستنی مافی هاووڵاتیبووندا، پێکەوە بهێڵێتەوە، بێ ئەوەی دیالێکتەکان شەڕی زمانی ستاندارد بکەن، یان زمانەکان خەریکی شەڕی یەکتر بن. ئەڵمانزمانان و فەرەنسیزمانانی سویسرا نایانەوێت سنووری وڵاتەکەیان بگۆڕن و تێکەڵاوی ئەڵمانیا و فەرەنسا ببنەوە.

چونکە ئەوان لە وڵاتەکەیاندا تەواوی مافی سیاسی، مەدەنی ، شەخسی، کولتووری و زمانییان پارێزراوە، بۆیە خۆیان بە هاووڵاتیی سویسرا دەزانن و لەو وڵاتەیشدا نە بە کەمینە دادەنرێن و نە جیاوازیشیان لەگەڵدا دەکرێت.

# زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی و بەستانداردکردنی

زمانی کوردی، وەک زمانی هەر گەلێکی دی، سەدان ساڵ تەنیا زمانی ئاخاوتن بووە. خەڵکی کورد لە زێد و ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵاتەکەیاندا، بە دیالێکتی جیاواز ئاخاوتوون. لەبەر ئەوەی کوردستان بە درێژایی سەدان ساڵ داگیر کراوە، زمانی زاڵ هەمیشە زمانی نەتەوەی داگیرکەر، عەرەب، تورک و فارس بووە. خوێندن و خوێندەواری بە زمانی ئەو نەتەوانە بوون. چەندان سەدە دەستەی خوێندەوار و رووناکبیری کورد، لە رێی ئەو زمانانەوە پێگەیشتوون و بە جیهانی زانین و زانست و رووناکبیری ئاشنا بوون. ئاشکرایە ئەو زمانانە نوێنەری کولتووری ئەو نەتەوانە و دەربڕی بیر و دنیابینی و بۆچوونی ئەو دەسەڵاتە بیانییانەیش بوون. ئەو زانین و زانیاری و پەیامە کولتوورییەیان هێناوە کە لەگەڵ باوەڕ و بەرژەوەندیی نەتەوەی سەردەست و دەسەڵاتدا گونجاون. بۆیە ئەو زمانانە لە لایەکەوە پەنجەرەیەک بوون بە رووی زانین و زانستدا، یان دروستتر بڵێم بە رووی جۆرێکی تایبەت و رێگەپێدراوی زانین و زانستدا، لە لایەکی دیکەشەوە ئامرازێک بوون بۆ پێکهێنانی هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتیی ساختە و چەسپاندنی کولتوور و پەیام و جیهانبینیی نەتەوەی داگیرکەر.

له هیچ کات و سەردەمێکدا داگیرکردنی عەسکەری، بەبێ داگیرکردنی کولتووریی نەیتوانیوە کاریگەر و بەردەوام بێت. سەپاندنی ئەو زمان و کولتوورانە، بە سەر کۆمەڵی کوردستاندا، پرۆسێسی داگیرکردنی عەسکەریی گۆڕیوە بە داگیرکردنی کولتووری و زەوتکردنی بیر و هۆشیاریی خەڵکی کورد. لەم ڕێگەیەشەوە کولتووری کورد، تا ڕادەیەک، ئاوێتەی کولتووری ئەو نەتەوانە بووە. دەسەڵات خۆی وەک پارێزەری کولتوورەکە وێنا کراوە، دیاردەی داگیرکردن و زاڵبوونی دەسەڵاتی داگیرکەری بیانی، ڕواڵەتێکی سروشتیی پێدراوە. سەرەنجام سەدان ساڵ هەستی بێ بنەمای هاوبەرژەوەندیی ئاینی و هاوچارەنووسیی ئاینی، جێگای هاوبەرژەوەندیی نەتەوەیی و هاوچارەنووسیی نەتەوەییان گرتۆتەوە.

له سەدەی شانزەیەم بە دواوە زمانی کوردی، لە سایەی میرنشینە کوردییەکاندا، لە زمانی ئاخاوتنەوە بەرەو زمانی نووسین چوو و زمانی ئەدەبیی کوردی پەیدا بوو. ئەم دیاردەیە، کە سەرەتای وەرچەرخانێکی گرنگی ژیانی کوردە، سەرەتا لە باکووری کوردستان و لە سایەی میرنشینی بۆتاندا دەرکەوت. شاعیران (مەلای جزیری، فەقێ تەیران، خانی..تاد) بەم شێوە زمانە نووسی و بناغەی شیعری کلاسیکیی کوردییان دامەزراند. شێوەزمانی ئەدەبیی کوردیی باکوور (کرمانجی) لەگەڵ ڕوخاندنی ئەم میرنشینە و میرنشینەکانی تری باکووری کوردستان دوایی هات. بەڵام زمانی کوردی، لە سەدەی هەژدەیەمدا، لە سایەی میرنشینی ئەردەڵاندا، بە شێوەزمانی گۆران (هەورامانی) بووە بە زمانی نووسین. شاعیرانی وەک (خانای قوبادی، بێسارانی، مەولەوی..تاد) پێشەنگی داهێنانی ئەم زمانە ئەدەبییە بوون. لە سەدەی نۆزدەیەمەوە ئەم شێوەزمانە ئەدەبییەیش، لە نووسیندا، کز بوو. شێوەزمانێکی نوێی ئەدەبی، لە سایەی میرنشینی باباندا،

دەرکەوت، کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە. هۆنراوەکانی (نالی، کوردی، سالم و مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بناغەی پێکهاتنی ئەم زمانە ئەدەبییە پێک دەهێنن[11].

ئەم زمانە ئەدەبییە نوێیە، کە هەندێک بە کوردیی خواروو، یان کوردیی ناوەڕاست و هەندێکی دیکەیش بە هەڵە، یان بە مەبەست و بۆ سووکایەتی پێکردن، بە (سۆرانی) ناوی دەبەن[12] بە جۆرێکی سروشتی، بۆتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد. لە سەرەتای سەدەی بیستەم بە دواوە، لە ڕێی نووسین و چاپەمەنی و خوێندنەوە بە فراوانی لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بڵاو بۆتەوە و چەسپیوە. سیستم و نۆرمی نووسین و ڕێنووسەکەی گەشەی کردووە. لە لایەکەوە بە جۆرێکی سەرنجڕاکێش، بەڵام هەندێک جار، بە زیادەڕۆیی و توندڕەوانە(١٤) لە وشەی عەرەبی پاک کراوەتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە بە هەزاران وشەی دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردی دەوڵەمەند کراوە. د. ئەورەحمانی حاجی مارف دەنووسێت (زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لە سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی کردووە بە دروست بوون و ڕێگەی خۆی گرتووەتە بەر و لە گەشەسەندندایە. چۆن زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو شتێک نییە ویست و ئارەزووی ئەم پادشا یان ئەو زانا ساز و تەیاری بدا، بە هەمان چەشن شتێکیش نییە، چەند زانایەک بە پێی نەخشە و پلانێک ئامادە و گەڵاڵەی بکەن، بەڵکو مێژووی نەتەوە خۆی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دێنێتە ئاراوە و هەر نەتەوەیەکیش ڕێگە و ڕێبازی تایبەتیی خۆی هەیە لە دروست کردنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا)[13].

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لەگەڵ دەرکەوتنی خوێندنی مۆدێرن و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لە باشووری کوردستاندا،

زۆرتر بڵاو بۆوە. ئەمڕۆ لە هەر بوارێکی ئەدەبی، فیکری، فەلسەفی، ئابووری، سیاسی، زانین و زانستدا سەدان بابەتی جۆراوجۆری پێ نووسراوە و وەرگێڕدراوە. نزیکەی سەدەیەکیشە زمانی ڕۆژنامەگەری و زمانی بزاڤی ناسیۆنالیستیی کورد و هەر حیزبێکی سیاسیی کوردی و هەر حوکمڕانی و دەسەڵاتێکی کوردی بووە، کە لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دامەزرێندرا بن (حوکمڕانی شێخ مەحموود، کۆماری کوردستان لە مەهاباد، حیزبی هیوا، کۆمەڵەی ژ. ک. پارتی دیموکراتی کورستان، شۆرشی ئەیلوول و دەسەڵاتەکەی، یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، بەرەی کوردستانی، پەرلەمان و حکومەتی کوردستان...تاد). ئەو ڕۆڵە مێژوویی و سروشتییەی ئەم زمانە ئەدەبییە بینیویەتی، بە بڕیاری سیاسیی هیچ حکومەت و پەرلەمان و سەرکردایەتییەکی سیاسیی کورد نەبووە، بەڵکو ڕەوشی گەشەکردنی ژیانی فیکری و کولتووری و سیاسیی کورد، کە لە زمانەکەیدا خۆی دەرخستووە، بە جۆرێکی سروشتی ئەم ڕۆڵە مێژووییەی بە زمانەکە داوە. بە واتایەکی دی ئەم زمانە، بەبێ بڕیاری سیاسی، بەرەو ستانداردبوون چووە و ستاتوسی زمانی ستانداردی پەیدا کردووە. بە کردەوەیش، لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، ڕۆڵی زمانی ستانداردی بینیوە و دەبینێت. بۆیە مرۆڤ بە دڵنیاییەوە دەتوانێت بڵێت کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، بەرهەمی خەباتی سیاسی و ڕووناکبیریی دووسەد ساڵەی کوردە و پوختەی ئەزموونی نەتەوەیی و مێژوویی و کولتووریی کورد، لەو زمانەدا قاڵ بوونەتەوە. ئەمڕۆ ئاستی ئەدەبی، فیکری، زانستی، سیاسی و کولتووریی کورد، پێش هەر شتێک، لە زمانە ئەدەبییەکەیدا و لە ئاستی زمانە ئەدەبییەکەیدا، خۆیان دەردەخەن.

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لەبەر ئەو ڕۆڵە گرنگەی بوویەتی، سنووری هەرێم و دیالێکتەکانی بڕیوە و بە ناوچە

جیاوازەکانی کوردستاندا بڵاو بۆتەوە. لە رەوشی بڵاوبوونەوەیدا تەنیا دیالێکتەکانی ئەو ناوچانەی نەهێناوەتە ژێر رکێفی خۆیەوە، بەڵکو خۆی، سروشتی دیالێکتی لەدەست داوە و لە رووی دەنگ و واتا و وشەسازییەوە، سروشتی گشتیی زمانی کوردی وەرگرتووە و بە هەزاران وشە و زاراوەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەوڵەمەند بووە. هەموو نیشانە و تایبەتمەندییەکانی زمانی ستانداردی بە خۆی گرتووە و کاریگەریی خۆی لە کۆمەڵی کوردستاندا سەلماندووە.

ئەمڕۆ ئەم زمانە ئەدەبییە، زمانی گشتیی پێنج ناوچەی فراوانی ناوەڕاست و باشووری کوردستان، بە چەندان دیالێکتەوە، پێک دێنێت. دەیانساڵیشە لەو ناوچانەدا، کە چوار دەسەلاتی میرنشینی و سێ حوکمڕانی کوردیی تێدا دروستبوون، رۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێت: ناوچەی میرنشینی بابان و حوکمڕانی شێخ مەحموود، کە ناوەندەکەی سلێمانییە، ناوچەی میرنشینی موکریان و حکومەتی کۆماری کوردستان، کە ناوەندەکەی مهابادە، ناوچەی میرنشینی سۆران، کە ئەمڕۆ ناوەندەکەی هەولێری پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، ناوچەی میرنشینی ئەردەلان، کە ناوەندەکەی سنەیە، لەگەڵ ناوچەی گەرمیان کە ناوەندەکەی کەرکووکە. لە پاڵ ئەمانەدا زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لەو ناوچانەی باشووری کوردستاندا، کە بە دیالێکتی هەورامی و لوڕ دەپەیڤن، بۆتە زمانی خوێندن و نووسین و بە تەواوی جێگای خۆی کردۆتەوە. لە ناوچەی بادینانیش نزیکەی هەموو رووناکبیران و سیاسەتمەداران و زۆرینەی خوێندەواران بەو زمانە ئەدەبییە ئاشنان و دەتوانن لە ئاخاوتن و خوێندنەوە و نووسیندا بەکاری بهێنن. بۆیە ئەم زمانە ئەدەبییە بە تەواوی پرەستیژ و لێهاتوویی خۆی، وەک زمانی ستاندارد سەلماندووە.

ستانداردکردنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لە باشووری کوردستاندا، دەتوانێت بنەمای یەکبوونی نەتەوەیی و

هەستی هاوزمانی و هاوکولتووری و هاوچارەنووسی، لە کۆمەڵی کوردستاندا، بەهێزتر بکات و سنوورێک بۆ هەستی دیالێکتپەروەری و شۆڤێنیزمی لەهجەیی دابنێت، کە ئەمڕۆ لە باشووری کوردستاندا بە زەقی دەرکەوتووە.

نزیکەی هەشتا ساڵێکە منداڵانی کورد، لە قوتابخانەکانی باشووری کوردستاندا، بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دەخوێنن. گۆڕینی خوێندن لەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەوە بۆ دیالێکت و شێوەزمانی تر، کارێکی ترسناکە، چونکە لە لایەکەوە ڕێگە لە هاوئاهەنگی نەتەوەیی و پرۆسێسی درووستبوونی نەتەوەی کورد دەگرێت، لە لایەکی دیکەوە دەتوانێت زمانی کوردی و گەلی کورد، لە باشووری کوردستاندا، بکات بە دوو زمان و ڕەنگە دوو گەلی خاوەن دوو کولتووری جیاواز، یان زیاتر. لە هەمان کاتدا ئەم کارە هەستی ناوچەگەری و دیالێکتپەروەری، لە نێو کەسانی سەر بە دیالێکتی تردا دروست دەکات. با لێرەدا نموونەیەک بهێنمەوە بۆ ئەوەی ڕاشکاوانەتر ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە بکەم.

لە کۆتایی سالانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا، خوێندنی کوردی لە قوتابخانەکانی باشووری کوردستاندا دەستی پێکرد. لە ناوچەی هەورامانی سەر بە پارێزگای سلێمانی، خوێندن بەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە بوو. ئەم کارە بە جۆرێکی سروشتی و ئاسایی و بە بێ گرفت سەری گرت، کەچی ئەم دیالێکتە لەناو نەچوو، بەڵکو تا ئێستا وەک جاران لە قسەکردن و گۆرانی و هونەردا هەر درێژە بە خۆی دەدات. هەروا ئەمڕۆ بە دەیان نووسەری گرنگی ناوچەی هەورامان بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەنووسن، هزر و کولتووری کورد بە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانیان دەوڵەمەند و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد، بە سەدان وشە و زاراوەی دیالێکتی

گۆران (هەورامانی) بە پیزتر دەکەن. کەچی ئەمڕۆ، پاش هەشتا ساڵ، شۆڤینیزمی لەهجەیی لە نێو هەندێک سیاسەتمەدار و خوێندەواری هەورامانیدا بە جۆرێک پەیدا بووە، کە تەنیا داوای خوێندن بەو دیالێکتە ناکات، بەڵکو دیالیکتی هەورامانی بە کوردی و خەڵکی هەورامان بە کورد نازانێت. ئەم بیر و بۆچوونە سیاسییە، شایەنی تێڕامان و لێدوانە، بە تایبەتی کە ساڵانێکە رای لەم جۆرە لە نێو ئێزدییەکانی باشووری کوردستان و زازاکانی باکووری کوردستاندا، کە سەر بە مەزهەبی عەلەوین، دەرکەوتووە.

ئایا بە راستی ئەوانەی بە دیالێکتی گۆران (هەورامانی) دەدوێن، گرووپێکی ئێتنیکیی تایبەتی جیاوازن و لەبەر ئەوە دەیانەوێت خۆیان لە کورد جیا بکەنەوە؟ یان هەندێک کەس بۆ ئامانجی سیاسی و تایبەتی خۆیان ئەم جۆرە بۆچوونانە بڵاو دەکەنە. ئێزدییەکان ئاینی جیاوازیان هەیە. زازاکانیش سەر بە مەزهەبی عەلەوین، کەچی دەستەیەکیان نەبێت، هەموویان خۆیان بە کورد دەزانن. بەڵام هەورامانییەکان جگە لە شێوەی ئاخاوتنیان، کە دیالێکتێکی زمانی کوردییە، توخمێکی تری کولتووری لە کورد جیایان ناکاتەوە. لە رووی زانستی زمان و ئەنترۆپۆلۆجییەوە، دیالێکتی زمان بە تەنیا ناتوانێت بنچینەیەک بۆ ئێتنیستی و خۆجیاکردنەوەی نەتەوەیی پێک بهێنێت. ئەگەر دیالێکت بە تەنیا بنەمای خۆجیاکردنەوەی ئێتنیکی و نەتەوەیی و زمانی بووایە، ئەوا ئەمڕۆ نەتەوەیەکی دنیا نەمابوو کە چەندان نەتەوە و گرووپی ئێتنیکی جۆراوجۆری لێ نەکەوێتەوە، چونکە زمان نییە کە چەندان دیالێکتی نەبێت. هیچ نەتەوەیەکیش، لە هیچ وڵاتێکی دنیادا، رێگەی نەداوە دیالێکتێکی زمان بکرێتە ئەلتەرناتیڤ (بەدیل)ی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و ستاندارد. بۆیە ئەم بۆچوونە، لە ناوەرۆکدا بۆچوونێکی سیاسییە و هۆکاری تری هەیە، کە ئێرە جێگای باسکردنی نییە. بەڵام بە پەیوەندی لەگەڵ باسەکەدا،

دەڵێم کە ئەم دیاردەیە یەکێکە لە ئەنجامەکانی سیاسەتی ژیاندنەوەی کولتووری خێڵایەتی و ناوچەگەریی، کە ئەمڕۆ هەموو سنوورێکی ماقووڵ و ناماقووڵی تێپەڕاندووە. بەهێزبوونی دیاردەی خێڵپەروەری و ناوچەپەروەی و چاوپۆشی لە ژنکوژی و هاندانی سوڵحی عەشایەری، لەسەر حیسابی مافی گشتی، لە ناوەرۆکدا شکستی پرۆژەی ناسیۆنالیزمی کورد، لە باشووری کوردستان و قەیرانی حکومەتی هەرێم دەردەخات، کە نەیتوانیوە لە ڕێی دەستوورێکی مۆدێرن و دیموکراتانەوە، بنچینەی دەستووریی هاوولاتیبوون دابمەزرێنێت و ئینتیمای نەتەوەیی هاوبەش و بیر و هەستی هاوچارەنووسی، هاوکولتووری و هاوئامانجی لە نێو کۆمەڵ(کۆمەڵگا)ی کوردستاندا بەهێز بکات. لە هەر شوێنێک کۆمەڵ نەتوانێت ماف و بەرژەوەندی و کەرامەتی هاوولاتیان بە جۆرێکی یەکسان، بپارێزێت، هاوولاتییان بە دوای سایەیەکی دیکەدا دەگەڕێن (خێزان، خێڵ...تاد) تا پارێزگارییان بکات.

خێڵپەروەری و ناوچەپەروەری، دیاردەی کۆمەلایەتیی پێش بە مۆدێرنبوون و بە کۆمەڵبوون و بە نەتەوەبوونن، ڕەنگدانەوەیان لە زمان و کولتووردا بە شێوەی دیالێکتپەرستی و سەنگەربەندیی کولتووریی دەبێت.

دەشێت لە بەر ڕووناکیی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە و هەندێک هۆکاری مێژوویی بۆ بانگەوازی هەندێک ڕووناکبیر و سیاسەتمەداری ناوچەی بادینان (بە تایبەتی دهۆک) بڕوانین کە هەر داوای خوێندن بە دیالێکتی بادینانی ناکات، بەڵکو لە بادینان ڕێ لە زمانی ئەدەبیی کوردی دەگرێت، دەیەوێت دیالێکتی بادینانی، لەو ناوچەیە، لە خوێندن و کاری ئیداری و حکومەتدا، جێگای زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، کە ستاتوسی زمانی ستانداردی هەیە،

بگریتەوە.

بەڵام بۆچی ئەوان دەیانەویت ناوچەکەیان، لە رووی زمانی و کولتوورییەوە، لەگەڵ بەشەکانی تری باشووری کوردستان تیکەڵ و هاوئاهەنگ نەبیت؟ ئایا ئەم کارە، ئەگەر سەربگریت، یەکبوونی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستاندا، کە هیشتا سەربەخۆیی خۆی بەدەست نەهیناوە، بەهیز دەکات یان لاواز؟

باشووری کوردستان وڵاتیکی فرەئیتنیک، فرەزمان و دیالیکتە، فرەئاین و مەزهەبە. ئەگەر بەشیکی کورد خۆی زمانی حکومەت و پەرلەمان و خویندن رەت بکاتەوە، چۆن دەتواندریت قەناعەت بە خەڵکی تری کوردستان، کە سەر بە گرووپی ئیتنیکی و نەتەوەیی ترن، بهیندریت تا لە پاڵ زمانی خۆیاندا، زمانی رەسمیی حکومەت و دەزگاکانی فیر ببن و بەکاری بهینن؟

بە رای من کاتی ئەوە هاتووە لیدوانی هیمنانە و بەرپرسانەی دوور لە دیالیکتپەروەی و ناوچەگەری، لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە بکریت، بەو ئامانجەی سیاسەتیکی زمانی دابریژریت کە تیکەڵبوون و هاوئاهەنگی و یەکبوونی نەتەوەیی گەلی باشووری کوردستان بەهیز بکات. چونکە ئەم داخوازییەی برایانی بادینان تەنیا مەیل و حەزی چەند کەسانیک نییە، کە پشت بە دەسەڵاتی سیاسی دەبەستن و بەداخەوە دەیانەویت خراپ بەکاری بهینن، بەڵکو پیشینەی میژوویی و کولتووریی خۆیشی هەیە، کە بە کورتی باسی دەکەین.

## دیالێکتی بادینانی و
## زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو

دیالێکتی بادینانی یەکێکە لە دیالێکتەکانی گرووپی کوردیی باکوور (کرمانجی) کە لە دیالێکتی (بۆتان، هەکاری، بایەزیدی.. تاد) پێک هاتووە. ئەم گرووپە دیالێکتە لە رووی رێزمان و تەسریف و جیاکردنەوەی وشە و حاڵەتی نێر و مێ، لەگەڵ گرووپی دیالێکتەکانی کوردیی ناوەڕاست و خوارووددا، جیاوازییان هەیە. سروشتی شاخاویی کوردستان و دابڕانی سیاسی و جیۆگرافیی، لە نێوان ناوچەکانی کوردستاندا، جیاوازیی نێوان ئەو دوو گرووپە دیالێکتەی زمانی کوردیی زیاتر کردووە.

کرمانجی (کوردی باکوور، لە قسەکردنی رۆژانەیاندا، زیاتر شێوەزمانەکەیان بە کرمانجی و خۆیشیان بە کرمانج ناو دەبەن) لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، لە باکووری کوردستاندا لە خوێندن و نووسین و گەیاندن و راگەیاندندا یاساخ کراوە. ئەم یاساخکردنە تا ئێستا، لە باکووری کوردستاندا، رێگەی لە دروستبوون و گەشەکردنی شێوەزمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو گرتووە، بۆیە دیالێکتەکانی کوردیی سەروو (کرمانجی) بە درێژایی دەیان ساڵ، لە ناوچەکانی خۆیاندا، تەنیا لە قسەکردندا بەکار هاتوون و گەشەیان کردووە. هەست و هزر و گیانی کوردی باکوور زیاتر لە گۆرانی و مۆسیقا و فۆلکلۆردا خۆیان دەرخستووە. رەنگە لەبەر ئەمەیش بێت کە گۆرانی و مۆسیقای کوردی، لە باکووری کوردستاندا، لە زۆربەی هەرێمەکانی دیکەی کوردستان، زیاتر گەشەی کردبێت و رەسەنتر مابێتەوە.

کرمانجی لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە تا سەرەتای ئەم سەدەیە، تەنیا لە دەرەوەی تورکیادا و بە پچڕ پچڕی، پێی نووسراوە. هێژا کامەران بەدرخان سالآنی ١٩٣٢- ١٩٤٣ لە ئێکسیل (سوریا) بەم شێوەزمانە گۆڤاری (هاوار)ی بڵاو کردەوە. بەڵام، دوای سەربەخۆبوونی سوریا، ئەو هەوڵە لە لایەن دەوڵەتی ناسیۆنالی عەرەبیی سوریاوە لەبار برا.

دوای ئەوە کرمانجی، وەک زمانی ئەدەبی، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا، جارێکی دی، لە ئێکسیل (سوێد) دەرکەوتەوە. هەندێک نووسەر و رووناکبیری باکووری کوردستان، دەستیان بە نووسینی کوردی کرد. لەبەر ئەوەی ئەوان تەنیا بە تورکی خوێندبوویان و لە نووسین و ئەدەبیاتی کۆن و نوێی کوردی دابڕابوون، زۆربەیان تەنیا ئەو دیالێکتەیان دەزانی کە لە ناوچەکەیان و لە ماڵەوە قسەیان پێ دەکرێت. بۆیە کرمانجیی نوێ لەو زمانە ئەدەبییە جیاوازە کە (مەلای جزیری و فەقێ تەیران و خانی و عەبدولرەزاق بەدرخان) و رووناکبیرانی سەردەمی رۆشنگەری (١٨٩٨-١٩١٣) پێیان نووسیوە. ساڵانێکە هەندێک رووناکبیری باکووری کوردستان کار بۆ پێکهێنان و چەسپاندنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیی باکوور و دانانی تێرم و زاراوەی نوێ دەکەن. بەڵام چارەنووسی شێوەزمانی کوردیی باکوور، لە بنەڕەتدا بە چارەنووسی سیاسیی گەلی باکووری کوردستانەوە بەستراوەتەوە. بەبێ ئازادبوونی زمانی کوردیی لە تورکیا و ناساندنی وەک زمانی رەسمی و بەکارهێنانی لە خوێندندا، زۆر سەختە ئەم زمانە لە بەرامبەر پەلاماری زمانی تورکیدا خۆی بگرێت، یان خۆی بسەپێنێت.

یاساخکردنی زمانی کوردی لە تورکیا لە لایەکەوە زمانی کوردی، لە باکووری کوردستاندا، وەک کۆمەڵە دیالێکتیکی لێک

دابڕاو هێشتۆتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە ئەم زمانەی لە بیر زۆرینەی کوردی باکوور بردۆتەوە. ئەمڕۆ زمانی تورکی، نەک کوردی، لە کاری سیاسی و هزری و نووسین و خوێندندا، بۆتە زمانی هاوبەشی کوردی باکوور. کەچی زمانی کوردی، لە لایەن پرۆپاگاندەی دەوڵەتی تورکەوە، بەردەوام بە زمانی خەڵکی لادێی و دواکەوتوو و وەحشی وێنا کراوە و بە جۆرێک لەلای بەشێکی خەڵکی کورد سووک کراوە، کە پێیان شەرمە قسەی پێ بکەن، وەک لە بەشێکی تردا باسی دەکەم.

دیالێکتی بادینانی، لە نووسیندا، چارەنووسێکی باشتری نەبوو. نووسین بەو دیالێکتە، بە شێوەیەکی بەرچاو، لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا، لە ئەدەبدا دەرکەوت. تا ئەو کاتە نووسەرانی بادینان، کە خوێندنیان بە زمانی عەرەبی بوو، هەر بە عەرەبی دەیان نووسی.

دوای داگیرکردن و لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقەوە، دەوڵەتی عیراق، بە پێی رێکەوتنێک لەگەڵ کۆمەڵەی نەتەوەکان، ناچارکرا هەندێک مافی کولتووری و ئیداری بۆ کورد، لەوانە خوێندن بە زمانی کوردی لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستاندا، بسەلمێنێت. بەڵام دەوڵەتی عێراق هەر لە سەرەتاوە رێگەی نەدا خوێندن، لە ناوچەی کەرکووک و بادیناندا، بە کوردی بێت. چونکە دەیەویست کەرکووک بەعەرەب بکات و دەڤەری بادینانیش، کە بە دیالێتێکی جیاواز قسە دەکەن، وەک دورگەیەکی دابڕاو، لە ناوچەکانی تری باشووری کوردستان، بهێڵێتەوە. ئامانجی ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە تێکەڵی و هاوئاهەنگیی کولتووری و زمانی و نەتەوەیی لە نێوان خەڵکی ناوچەی بادینان و خەڵکی ناوچەکانی تری باشووری کوردستاندا دروست نەبێت. لە بەرامبەر ئەمەدا رووناکبیران و سیاسەتمەدارانی ناوچەی بادینان هەوڵیان نەدا فشار بۆ دەوڵەتی

عێراق بەرن تا منداڵانی ناوچەی بادینان لە جیاتی زمانی عەرەبی بە زمانی کوردی بخوێنن. بەپێچەوانەوە بەشێکیان پێیان باشتر بوو کە منداڵەکانیان لە قوتابخانە، بە زمانی عەبی بخوینن، نەک بە زمانی کوردی.

بە پێی ڕێککەوتننامەی یازدەی ئاداری ١٩٧٠ دەبوو خوێندن لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیی هەرێمی کوردستاندا، لەوانە پارێزگای دهۆک، بە کوردی بێت. ئەو کاتە دەوڵەتی عیراق و دەستەیەکی لەهجەپەرستی، بادینان ویستیان خوێندن لەو دەڤەرە بە دیالێکتی بادینانی، نەک بەزمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی بێت، تاکوو بادینان لە رووی کولتوورییەوە، بە دابڕاوی لە ناوچەکانی تری هەرێمی کوردستان بهێڵنەوە. بەڵام سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، مەلا مستەفای بارزانیبارزانی، ئەو داواکارییەی رەت کردەوە[١٤].

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی تا ساڵی ١٩٧٥ لە قوتابخانەکانی ناوچەی بادیناندا، بەبێ گرفت، زمانی خوێندن بوو. بەڵام دوای تێکشکانی بزاڤی چەکداریی ئەیلوول، لە بەهاری ساڵی ١٩٧٥دا، دەستەیەک پیاوی بەعس و لەهجەپەرستی دەڤەری بادینان، چەند هەزار ئیمزایان کۆ کردەوە و داوایان کرد کە زمانی عەرەبی، لە جیاتی کوردی، لە بادینان بکرێتەوە بە زمانی خوێندن. دیارە دەسەڵاتی شۆڤێنیستی بەعس، پشتگیری ئەو داواکارییەی کرد. چونکە دابڕینی بادینان، لە ناوچەکانی تری باشووری کوردستان، هەمیشە بەشێکی گرنگی ستراتیجیای دەوڵەتی عێراق و بەعس بووە.

دەڤەری بادینان، بە درێژایی دەیان ساڵ لە کۆمەڵ و کولتووری ناوچەکانی تری باشووری کوردستان دابڕاوە و بەر پەلاماری کولتووریی عەرەب کەوتووە. لە بەرامبەر ئەمەدا هیچ دەرفەتێکی بۆ

نه ڕەخساوە تا بە جۆرێکی سروشتی پەیوەندیی کولتووری، کۆمەلایەتی و سیاسی لەگەڵ کوردی باکووری کوردستاندا ببەستێت. تا ئەمڕۆیش نە خەڵکی باکووری کوردستان و نە نووسەرانیان دەتوانن تاکە لاپەڕەیەکی ئەو نووسینانە بخوێننەوە کە ڕووناکبیران و نووسەرانی بادینان، بە دیالێکتی بادینانی دەینووسن. چونکە، لە پاڵ جیاوازیی ئەم دیالێکتە لەگەڵ دیالێکتەکانی تری کرمانجی، کوردی باکوور ناتوانن بە ئەلفوبێی کوردی بخوێننەوە. لەمەیش زیاتر ڕووناکبیرانی باکووری کوردستان، کە لە مەنفا (ئێکسیل) دەستیان بە کوردینووسین کردووە، بە داخەوە دەڵێم، لە تورک زیاتر ئەلفوبێی تورکییان لەلا پیرۆز کراوە، بۆیە ئامادەنین (ڕەنگە بە نەنگیی بزانن) کە تاکە هەفتەیەکی کاتی خۆیان بۆ فێربوونی ئەلفوبێی کوردی (یان خۆیان وتەنی هەرفی ئارەبی) تەرخان بکەن، هەر نەبێت بۆ ئەوەی ئەو ئەدەبیاتە بخوێننەوە کە لە بادینان، بە دیالێکتێکی نزیکی شێوەزمانەکەیان دەنووسرێت. لە جیاتییان داوا دەکەن کوردی باکووری کوردستان ئەو ئەدەبیاتەیان بۆ ترانسکریپت بکەن (بیگۆڕنە سەر ئەلفوبێی لاتینی) و جارێکی دی بۆیان چاپ بکەنەوە! کەچی عەرەبەکانی تورکیا (لە ناوچەی ئەسکەندەروونەی بندەستی تورکیا) کە ژمارەیان دەیەکی کورد نابێت و بە دیالێکتێکی عەرەبی دەدوێن، خۆیان فێری ئەلفوبێی عەرەبی کردووە و لەم ڕێگەیەوە پەیوەندییەکی بە هێزی کولتووری و نەتەوەییان لەگەڵ کولتووری عەرەبی و گەلانی عەرەبدا دروست کردووە و زمان و کولتووری خۆیان پاراستووە.

خەڵکی بادینان نزیکەی سەدەیەکە، لە ڕێی دیوارێکی بەرزی سیاسی و کولتوورییەوە، لە گەلی باکووری کوردستان جیا کراونەتەوە. لەو کاتەوە چارەنووسی سیاسی و نەتەوەییان، بە چارەنووسی خەڵکی ناوچەکانی تری باشووری کوردستانەوە

بەستراوەتەوە. ئایا بۆ ئەوان باشترە کە وەک دوورگەیەکی دابڕاو، لە ناو قەڵای کولتوور و دیالێکتەکەیاندا، بمیننەوە یان زۆرتر تێکەڵاوی ژیانی کولتووریی گەلی باشووری کوردستان ببن؟

ئایا گەلی باشووری کوردستان، کە هێشتا سەربەخۆ نییە، بەرگەی ئەوە دەگرێت کە لە پرۆگرامی خوێندن و دەزگاکانی حکومەتدا و لە بەرامبەری دەوڵەت و گەلی عەرەبی عێراقدا دوو زمان، یان دوو شێوە زمان بەکار بهێنێت، وەک هەندێک رووناکبیر و سیاسەتمەداری ناوچەی بادینان دەخوازن؟

خوێندکارانی بادینان مافی خۆیانە، لە هەر ئاستێکی خوێندندا، کە پسپۆرانی پەروەردە بە باشی بزانن، دیالێکتی بادینانی لە پاڵ زمانی ئەدەبیی کوردیدا بخوێنن. نووسەران و هونەرمەندانی بادینان دەتوانن جوانترین شاکاری ئەدەبی و هونەری بەم شێوەزمانە بەرهەم بهێنن و گەشەی پێ بدەن. پەیڕەوکردنی ئەم مافە بەو مانایە نییە کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی (کە هەندێک بادینی و کوردی ئێرانی، کە لە ئەورووپا فێری خوێندنەوەی کوردی بوون، بۆ سوکایەتیکردن بەو زمانە، بە سۆرانی ناوی دەبەن) لە بادینان، یان لە هەر ناوچەیەکی تری باشووری کوردستاندا، وەک زمانێکی بێگانە تەماشا بکرێت و لە خوێندن و دەزگاکانی حکومەتدا پێشی پێ بگیرێت، بەکار نەهێندرێت. چونکە کارێکی لەو جۆرە ئەو ناوچەیە، لە رووی رووناکبیری، کۆمەڵایەتی و هاوئاهەنگی نەتەوەییەوە، لە ناوچەکانی تری باشووری کوردستان زیاتر دادەبڕێت، زمانی کوردیش بە تەواوی دەگۆڕێت بۆ دوو زمان.

ئەگەر زۆرینەی خەڵکی بادینان دیالێکتەکەیان بە زمانێکی سەربەخۆ و جیاواز لە زمانی کوردی دەزانن، دەتوانن ئازادانە ئەو رایە بۆ لێدوان و باسکردن رابگەیەنن و بەڵگەی زانستیی خۆیان

(ئەگەر هەبێت) بخەنە روو. دوای ئەوە ئەگەر لەسەر باوەڕی خۆیان مانەوە، خەڵکی تر، کورد و غەیرەکورد، دەبێت ڕێزی رای ئەوان بگرن و قبوولیشی بکەن. زانستی زمان و نزیکی و دووریی بادینانی لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لەم مەسەلەیەدا، کە مەسەلەیەکی سیاسییە، دادی کەس نادات. مرۆڤ و گرووپەکان خۆیان پێناسە (هەویە-ئایدینتیت) ی نەتەوەیی خۆیان و زمانەکەیان دیاری دەکەن و دەبێت خەڵکی تریش، ڕێزیز لە پێناسەکەیان بگرن و تەنانەت قبووڵی بکەن.

بەڵام (هێندەی من ئاگادار بم) رایەکی لەم جۆرە لە نێو زۆرینەی خەڵکی بادیناندا زاڵ نییە. بۆیە بادینانی بە دیالێکتێکی زمانی کوردی دادەنرێت. کەواتا ئەم دیالێکتە، لە باشووری کوردستاندا، چەند لە نووسیندا بەکاربهێندرێت، ستاتوسی دیالێکتی دەبێت. هیچ دیالێکتێکیش، ناتوانێت ئەلتەرناتیڤ (بەدیل)ی زمانێک بێت، کە هەشتا ساڵ زیاترە زمانی خوێندن و سیاسەت و زانستە بۆتە زمانی پەرلەمان و حکومەت و دەزگاکانی.

دیالێکتی بادینانی، وەک دیالێکتێکی زمانی کوردی، دەکرێت تەنانەت لە پلەی ناوەندی، یان ئامادەیی قوتابخانەکانی باشووری کوردستاندا بیخوێندرێت، تا خوێندکاران پێی ئاشنا ببن، سوود لەو سامانە ئەدەبی و رووناکبیرییە وەربگرن کە بەو دیالێکتە نووسراوە و دەنووسرێت. لەمەیش زیاتر لە ڕێی فێربوونی ئەو دیالێکتەوە بتوانن، ئەدەبیاتی شێوەزمانی کرمانجییش بخوێننەوە. بەڵام لە دیدی بەرژەوەندیی نەتەوەییەوە ناکرێت دیالێکتی بادینانی و هیچ دیالێکتیکی دیکەی کوردی، لە بادینان یان لە هەر ناوچەیەکی باشووری کوردستاندا، ببێتە ئەلتەرناتیڤی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی. هیچ نەتەوە و دەوڵەتێکیش، ڕێگەی نەداوە و ڕێگەیش نادات دیالێکتێکی زمانەکەی، لە ناوچەیەکی وڵاتدا، لە رووی زمانی حکومەت

و دەزگاکانیدا بوەستێتەوە و جێگای ئەو بگرێتەوە. لە هەر وڵاتێکدا هەوڵی لەو جۆرە درابێت، ئەوا بەو ئامانجە سیاسییە بووە (یان بەو ئەنجامە سیاسییە گەیشتووە) کە خەڵکی سەر بە دیالێکتەکە خۆیان لە نەتەوەکە جیا بکەنەوە و پێناسە (ئایدینتیتی)ی جیاوازی کولتووری-نەتەوەیی بۆ خۆیان پێک بهێنن.

هەندێک لەوانەی داوا دەکەن کە دیالێکتی بادینانی، لە بادینان، جێگای زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو (زمانی حکومەت و پەرلەمان) بگرێتەوە، بە تایبەتی رووناکبیرانی باکووری کوردستان، ئەزموونی وڵاتی نەرویج بە نموونە دەهێننەوە.. لەبەر ئەوەی ئەم نموونەیە، کە تاقانەیە، بە ناتەواوی و زۆر جاریش بە مەبەستی چەواشەکردن باس دەکرێت، لێرەدا بە کورتی ئاماژەی بۆ دەکەم.

# ئەزموونی نەرویج

زمانی نەوریجی، وەک دیالیکتێکی زمانی سکاندیناڤیا، لە سەدەی سێزدەیەمدا، لە دەرباری شایانی نەوریجدا، وەک زمانی نووسین پەیدا بوو[١٥]. کاتێک پاشایانی نەرویج دەسەلاتیان لاواز بوو، نەرویج بە ناچاری لەگەڵ دانمارکدا یەکی گرت (راستییەکەی کەوتە ژێر دەستی دانمارک). دوای ئەوە زمانی ئەدەبیی نەرویجی، لە بەردەم زمانی کۆنی دانمارکیدا پاشەکشەی کرد و لەناوچوو. زمانی کۆنی دانمارکی، لە نەرویج، بوو بە زمانی خوێندن و نووسین. لە دەزگاکانی دەوڵەت و کلێسادا، کە ناوەندی خوێندن و خوێندەواری بوون، تەنیا زمانی کۆنی دانمارکی بەکار دەهات. نووسەران، زانایان و رووناکبیران، هەر ئەو زمانەیان لە نووسیندا بەکار دەهێنا. بەڵام لە شارۆچکە دوورەکان و گوندەکانی نەرویجدا، کە زمانی دانمارکی زاڵ نەبوو، دیالێکتەکانی زمانی نەرویجی لە پەیڤین و ئاخاوتندا، نەک لە نووسیندا، بەکار دەهاتن و دوور لە کارتێکردنی زمانی دانمارکی، گەشەیان دەکرد.

زمانی دانمارکی، له پرۆسێسی بەکارهێنان و بڵاوبوونەوەیدا، شێوە و تایبەتمەندیی زمانی نەرویجیی وەرگرت. لە شارەکانی نەرویجدا زمانێکی قسەکردن پێک هات کە پڕ بوو لە وشەی دانمارکی. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا یەکێتیی نێوان نەرویج و دانمارک هەڵوەشایەوە و نەرویج لە دانمارک ئازاد بوو. لە ساڵی ١٨١٤دا، نەرویج لەگەڵ سوید یەکی گرت (راستییەکەی کەوتە ژێردەستی سوید) بەڵام هێشتا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، یان ستانداردی نەرویجی پێک نەهاتبوو. دوای ئەو یەکگرتنە خولیای پێکهێنانی زمانی ستانداردی نەرویجی، لای کۆمەڵێک رووناکبیر و سیاسەتمەداری نەرویجی پەیدا بوو. ئەو زمانە ئەدەبییە دانمارکییەی لە نەرویجدا بەکار دەهات، گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتبوو. بە زمانی نەرویجی متوربە و مشتوماڵ کرابوو، یان دروستتر بڵێم زمانەکە بە نەرویجی کرابوو. لە هەمان کاتدا زانا و ئایدیۆلۆجیستی زمان (کنود کنودسێن) و لایەنگرانی، توانییان هەنگاو بە هەنگاو ئەم زمانە دانمارکییە بە نەرویجیکراوە بگۆڕن، ریفۆرمی تێدا بکەن و بیکەن بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەرویجی.

بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا، هەندێک رووناکبیر هەوڵێکی رادیکالانەیان دەدا بۆ ئەوەی زمانێکی ئەدەبیی نوێی نەرویجی، لە دیالێکتی جۆراوجۆری گوندەکانی نەرویج، پێک بهێنن. نووسەر (ئیڤار ئاسێن) نەخشەسازی ئەو شێوەزمانە نەرویجییە بوو. ئەو هەوڵە بەشێک بوو لە خەباتی ناسیۆنالیستانی نەوریج کە دەیانەویست، لە رێی زمانەکەیانەوە، تایبەتمەندیی نەتەوەیی خۆیان، لە بەرامبەری سویددا، هەڵببڕن. بە کورتی، لە سەدەی نۆزدەیەمەوە، دوو بۆچوون لە بارەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەوریجییەوە دەرکەوت. یەکەمیان پێی وابوو زمانی ئەدەبیی باو بکرێتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و زمانی ستانداردی نەرویج. دووەمیان لەو باوەڕەدا بوو

کە لە دیالێکتەکانی زمانی نەرویجی، زمانێکی نوێی ئەدەبی و ستاندارد پێک بهێندرێت.

هەردوو بۆچوون لایەنگرانی زۆریان هەبوو. بۆچوونی یەکەمیان لە شارەکان و لە نێو خوێندەواری شار و رووناکبیرانی کۆنسێرڤاتیڤ (موحافەزەکار)دا پشتگیری دەکرا. بۆچوونی دووەمیان لە گوند و شارۆچکەکان و لە نێو سیاسەتمەدارە رادیکالەکاندا داکۆکی لێ دەکرا. ساڵانێکی زۆر لێدوان و ئاخاوتن لە بارەی ئەم مەسەلەیە بەردەوام بوو. سەرەنجام لە ساڵی ١٨٨٥ دا دوو شێوە زمانی نەرویجی لە نووسیندا دەرکەوتن و هەردووکیان خۆیان سەپاند. ئەمڕۆ یەکەمیان بە زمانی کتێب (مۆلبوک) و دووەمیان بە نەرویجیی نوێ (نینۆرشکە) ناسراون. زیاتر لە (٨٠%)ی قوتابیانی نەرویج بە مۆلبوک دەخوێنن. کەچی زۆر کەمتر لەسەدا بیست (٢٠%)ی خوێندکاران، بە نەرویجیی نوێ دەخوێنن، بەبێ ئەوەی شێوەزمانی مۆلبوک . لەو ناوچانەدا رەت بکرێتەوە. کەچی تا پەنجاکانی سەدەی رابردوو نزیکەی لە (٢٥%)ی منداڵان بە نەرویجیی نوێ دەیان خوێند. ئەم دوو شێوە زمانە لە بنەڕەتدا زۆر لێک نزیکن و بە درێژایی دەیان ساڵیش هەوڵ دراوە و دەدرێت لێک نزیکتر بکرێنەوە. ئەمڕۆ جیاوازیی نێوان ئەم دوو زمانی نووسینە هێندە کەم بۆتەوە، کە بە دوو شێوە (فۆرم)ی یەک زمان دادەنرێن، نەک دوو زمان. بە رای نووسەری سوێدی (تورێ یانسۆن) هەر سوێدییەک، کە بە ئاسانی لە زمانی نەوریجی دەگات، لە خوێندنەوە و بیستندا هەست بە جیاوازیی نێوان ئەو دوو شێوە زمانە ناکات[١٦].

**لێرەدا بە گرنگی دەزانم ئاماژە بۆ تایبەتمەندییەکانی ئەزموونی نەرویج بکەم:**

**یەکەم:** نموونەی نەرویج تەنیا بەرهەمی سەردەم و شوێنێکی جیاواز نییە، بەڵکو نموونەیەکی تایبەت و تاقانەیە و لە هیچ وڵاتێکی دیکەی دنیادا دووبارە نەبۆتەوە، بۆیە کۆپیکردنەوەی ئەم ئەزموونە (تەنانەت بە شێوە ئەسڵەکەی، نەک بەو جۆرە شێوێندراوەی هەندێک لەهجەپەرست باسی دەکەن) لە باشووری کوردستاندا ، کە هێشتا سەربەخۆ نییە، کارێکی شیاو و عەقڵانی نییە، بەڵکو سەرەڕۆیانە و ترسناکە.

**دووەم:** شێوەزمانی نەرویجیی نوێ لە خەباتی رزگاریخوایی نەتەوەییدا و لە بەرامبەری زمانی داگیرکەری بێگانەدا دەرکەوت، بەو ئامانجەی ئەم زمانە نوێیە پێناسەی نەتەوەیی گەلی نەرویج، لە بەرامبەری دانمارک و سوێددا، کە حوکمڕانی نەرویجیان دەکرد، بەهێزتر بکات. لەبەر ئەوەی گەلانی سکاندیناڤیا سەر بە مەزهەبی پرۆتستانتن، زمان گرنگترین توخمی کولتووری و گەورەترین فاکتەری خۆجیاکردنەوەی نەتەوەیی و تایبەتمەندیی کولتووریی هەر وڵاتێکیانە. نەرویجیی نوێ دەشێت وەڵامدانەوەیەکی ئەو تۆمەتانەی هەندێک ناسیۆنالیستی دانمارکی و سوێدی بووبێت، کە پێیان وابوو گەلی نەرویج زمانی تایبەتی خۆی نییە و زمانەکەی، تەنیا شێوەیەکی بە نەرویجیکراوی زمانی دانمارکییە. ناسیۆنالیزمی نەرویجی، کە خەباتی بۆ سەربەخۆبوونی وڵاتی نەرویج دەکرد، پێکهێنانی ئەو زمانەی وەک بەشێک لە پرۆسێسی رزگاربوون و دروستکردنی نەتەوەی نەرویج دانا.

**سێیەم:** نەرویج سەد ساڵ زیاترە دەوڵەتێکی سەربەخۆیە. پێشتریش سەدان ساڵ، وەک هەرێمێکی یەکگرتووی جیاواز و تایبەت، لەگەڵ دانمارک، یان سویدا هەبووە و تایبەتمەندییەکانی بە گرنگ وەرگیراون. زۆربەی کاتیش خاوەن پاشای تایبەتیی خۆی بووە. هەروا وڵاتێکی مۆدێرن و پێشکەوتووە و کۆمەڵەکەی، بە کۆمەڵی رەفاه ناو دەبرێت. ئایا دەکرێت و شیاوە گەلێکی بێ دەوڵەتی چارەنووس تەماویی وەک گەلی باشووری کوردستان، بە تەنیا لە نێو هەموو گەلانی دنیادا، کوێرانە لاسایی نەرویج بکاتەوە؟

**چوارەم:** خوێندنی شێوەزمانی نەرویجیی نوێ، لە قوتابخانەکاندا، بۆ بریاری کۆمۆنەکانی نەرویج بەجێ هێڵدراوە و بە هیچ شێوەیەک بۆ تەحەداکردن و لاوازکردنی زمانی ئەدەبیی نەرویجی نییە و لە هیچ دەڤەرێکی وڵاتی نەرویجدا نەکراوەتە ئەلتەرناتیڤی ئەو زمانە ئەدەبییە. مۆلبووک لە سەرانسەری نەرویجدا، هەمان ستاتووس و ئیعتیباری هەیە و بەکار دەهێندرێت.

**پێنجەم:** بەکارهێنانی دوو زمان لە نووسین و خوێندندا، کە ئەزموونێکی تاقانەی نەتەوەی نەرویجە و لە دنیادا نموونەی نییە، دەکرا نەتەوەی نەرویج بکاتە دوو نەتەوەی جیاواز. بەڵام نەرویج دەیان ساڵە وڵاتێکی سەربەخۆی دیموکراتە و مافی هاووڵاتیبوون و ئازادیی مرۆڤ و یەکسانبوونیان لەبەردەم یاسادا بە جۆرێک چەسپێندراوە، کە ئینتیما بۆ نەرویج و نەرویجیبوون لە سەرووی هەر ئینتیمایەکی ترەوەیە. ئەو نەرویجییانەی بە هەرکام لەو دوو شێوەزمانە دەدوێن و دەنووسن، خۆیان بە نەرویجی و شێوەزمانەکەیان بە نەرویجی دادەنێن و شانازی بە هەردوو شێوەزمانەکەوە دەکەن. دەوڵەتی نەرویجیش بە پێی سیاسەتێکی ژیرانە و مەسئولانەی زمانی و کولتووری، تا ئەمڕۆ و بەردەوام

هەوڵی لێک نزیکردنەوەی ئەم دوو شێوەزمانە دەدات. ئەم دوو شێوەزمانە هێندە لێک نزیک کراونەتەوە، کە هەر نەرویجییەک بە بێ هیچ گرفتێک لە هەردووکیان دەگات. خەڵکی وڵاتانی تری سکاندیناڤیایش، لە کاتی خوێندنەوە و بیستنی هەر شێوەزمانێکیاندا، وەک یەک زمان دەیبینن و، بە دەگمەنیان هەست بە جیاوازیی نێوانیان دەکەن.

**شەشەم:** شێوەزمانی نەرویجیی نوێ، لە بنەڕەتدا دیالێکتیکی گۆشەگیر و دابڕاوی ناوچەیەکی دیاریکراوی نەرویج نییە، بەڵکو شێوەزمانێکە، کە (ئیڤار ئارسێن) و کۆمەڵێک نووسەر، لە چەند دیالێکتێکی زمانی نەرویجی و بۆ سەلماندنی هەبوونی زمانی نەرویجی، پێکیان هێناوە. بۆیە ئەو شێوە زمانە (یان وەک نەرویجییەکان دەڵێن، ئەو فۆرمەی زمانی نەرویجی) لە ناوچەیەکی تایبەت و دابڕاودا نییە، بەڵکو لە رەوشی سیاسی-مێژوویی نەتەوەی نەرویج و خەباتی ناسیۆنالیستیدا، لە کۆمەڵە ناوچەیەکی جیاواز و لێکدابڕاودا خۆی سەپاندووە. ئەوانەی بەو شێوە زمانە دەدوێن ناتوانن، هەر نەبێت لە رووی جیۆگرافیاوە، خۆیان لە نەرویج دابڕن.

**حەوتەم:** شێوەزمانی نەرویجیی نوێ، کەمتر لە ٢٠%ی خوێندکارانی نەرویج پێی دەخوێنن. زۆر لەمەیش کەمتر نووسەرانی نەرویجی پێی دەنووسن.

**هەشتەم:** لە دوای سەربەخۆبوونی نەرویج، لە ساڵی ١٩٠٥دا، بە دەیان دەوڵەتی نەتەوەیی لە جیهاندا دامەزرێندران و بە دەیان زمانی فرەدیالێکت، لە وڵاتانی جۆراوجۆردا، کران بە زمانی ستاندارد، بەڵام بۆچی تاکە وڵات و نەتەوەیەکی دنیا ئەزموونی نەرویجی کۆپی، یان دووبارە نەکردۆتەوە؟

بەڵام لە بەرامبەر ئەم ئەزموونە تاقانەیەی نەرویجدا، کە بەرهەمی دۆخێکی مێژوویی زۆر تایبەتە و کۆپی ناکرێت، وڵاتانی تری دنیا تەنیا یەک فۆرمی زمانی نەتەوەییان (مەبەست لە زمانی نەتەوەیە، نەک زمانی جیاوازی گەل و نەتەوەی تری نێو وڵات) بە زمانی ستاندارد ناسیوە. دیالێکتەکانی تری زمانی نەتەوە، چەند لە زمانی دەوڵەت جیاواز بن، لە سنووری دیالێکتدا ماونەتەوە و لە سیستمی خوێندن و کاری دەوڵەتدا جێگایان نەکراوەتەوە. ئێمە پێشتر، لەم بارەیەوە، هەندێک نموونەمان هێنایەوە، بەڵام رەنگە نموونەی (کۆسۆڤۆو ئەلبانیا) هەروا (چین و تایوان) بۆ کورد گرنگ و مایەی تێرامان بن.

کۆسۆڤۆکانی یۆگۆسلاڤیای هەڵوەشاوە ئەلبانی زمانن. بەڵام دیالێکتەکەیان و نۆرمی قسەکردنیان زۆر لە زمانی ستانداردی وڵاتی ئەلبانیا جیاوازە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان، بۆ بەهێزکردن و پاراستنی یەکبوونی نەتەوەییان لەگەڵ ئەلبانیادا، ژیرانە زمانی ستانداردی ئەلبانیان، وەک زمانی ستانداردی خۆیان هەڵبژاردووە و کردوویانەتە زمانی خوێندن و حکومەتی کۆسۆڤۆ و دەزگاکانی. نموونەیەکی تر زمانی ستانداردی چینییە. لە چیندا دەیان دیالێکت هەیە و لە زمانی ستانداردی چینی جیاوازن. زۆربەی خەڵکی سەر بەو دیالێکتانە بە دەگمەن لە قسەکردندا لە یەکتری دەگەن. کەچی هەموو چینییەکان، بەوانەیشەوە لە دەرەوەی سنووری دەوڵەتی چینن، یەک زمانی ستانداردیان هەیە، کە بە (ماندەرین) ناسراوە. وڵاتی تایوان کە نیوسەدە زیاترە وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ، لە (چین) جیا بۆتەوە، کەچی دەوڵەتی تایوان هەمان زمانی ستانداردی چینی (ماندەرین) وەک زمانی دەوڵەت و سیستمی خوێندن بەکار دێنێت، هەرچەندە نۆرمی زمانی قسەکردن لە تایوان، زۆر لە زمانی ستانداردی چینی جیاوازە [١٧].

کەواتا دەکرێت بپرسین، ئایا راستە ئێمە، لە باشووری کوردستاندا، کە هێشتا سەربەخۆ نین، کوێرانە، بەبێ لێدوانی کراوە و ئازادانە و بەبێ دیراسەکردنی زانستییانە، بە جۆریکی هەڵە لاسایی وڵاتی نەرویج بکەینەوە؟

رەنگە پرسیاری لەمەیش گرنگتر ئەوە بێت، کە ئایا دەکرێت لەهجەیەکی زمانی کوردی، بادینانی، کە چەند ساڵێکی کەمە پێی دەخوێندرێت و دەنووسرێت و هێشتا زیاتر زمانی ئەدەب و هونەرە، بکرێتە جێگرەوە (ئەڵتەرناتیڤ)ی زمانی ئەدەبیی کوردی لە باشووری کوردستاندا. ئەگەر ئەمە بۆ لەهجەی بادینانی رەوا بێت، ئەی بۆچی هەمان شت بۆ لەهجەی هەورامانی لوڕییش رەوا نەبێ؟

لەهجەی بادینانی، سەر بە گرووپی بنلەهجەکانی کرمانجییە، بەڵام لە ریشەکەی خۆی (کرمانجی) دابڕاوە و تەنیا لە ناوچەی بادینان بەکار دەهێندرێت. کوردی باکووری کودستان، نە بەو لەهجەیە دەپەیڤن، نە پێی دەنووسن، نە ئەو بەرهەمانەیش دەخوێننەوە کە بەو لەهجەیە دەنووسرێن. چونکە بادینانی بە ئەلفوبێی کوردی دەنووسرێت، نەک لاتینی-تورکی. هەروا زۆربەی رووناکبیرانی باکووری کوردستان، دیالیکتی ناوچەی جزیرەیان کردۆتە بناغەی نووسینی شێوەزمانی کرمانجی. هەندێکیشیان دیالێکتی هەکاری، کە وابزانم کوردەکانی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە لە نووسیندا بەکاریان دەهینا، بە گونجاوتر دەزانن. بۆیە کوردی باکوور، لەهجەی بادینانی، وەک زمانی ئەدەبیی یەککگرتووی کرمانجی، قبووڵ ناکەن. تەنانەت بە کەمبایەخەوە بۆ ئەو لەهجەیە دەڕوانن بۆیە لەهجەی بادینانی، جگە لە ناوچەی بادینان، نەیتوانیوە و ناشتوانێت پەل بۆ هیچ ناوچەیەکی دیکەی کرمانجیزمان بهاوێت. بەلای زۆریشەوە، وەک دوورگەیەکی لەهجەیی-زمانی، دابڕاو لە کوردیی باکوور و کوردیی خواروو، هەر لە بادیناندا، دەمێنێتەوە.

ئەمڕۆ کورد، لە ئاستی هەموو کوردستاندا، سێ شێوەزمان لە نووسیندا بەکار دەهێنێت؛ کوردیی زازایی، کوردیی خواروو و کوردیی سەروو (کە خۆیان بە کرمانجی ناوی دەبەن). بە کوردی و کرمانجی، کورد کراوەتە نەتەوەیەکی سێزمانی، نەک جووتزمانی.

زازاکانی باکووری کوردستان، کە زۆرینەیان خۆیان بە کورد دەزانن، لەهجەی زازا لە نووسیندا بەکار دەهێنن.

کوردی باشوور و رۆژهەلاتی کوردستان، دەیان ساڵە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە. ئەو زمانە ئەدەبییە، لە گرووپی بنلەهجەکانی کوردیی ناوەڕاست-خواروو پێک هاتووە، کە بریتین لە بنلەهجەی سلیمانی، سنە، سۆران، موکریان و گەرمیان. هەر یەک لەو ناوچانە، جگە لە گەرمیان، پێشتر پایتەخت، یان ناوچەی یەکێک لەمیرنشینەکانی بابان، ئەردەلان، سۆران و موکریان بوون.

بەڵام شێوەزمانی کرمانجی، کە سەدەیەکە دەوڵەتی تورک، لە باکووری کوردستاندا، هەوڵی کوشتنی دەدات، ئێستا بەرەو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دەچێت.

ئەو نووسەر و رووناکبیرە بەرێزانەی بادینان و هی تر، کە شەڕی زمانی ئەدەبیی کوردی (یان خۆیان وتەنی سۆرانی) دەکەن، باشترە بیر لە داهاتووی شێوەزاری کرمانجی (کوردیی سەروو) بکەنەوە. لەگەڵ رووناکبیرانی باکووردا، رێسا و بناغەی هاوبەش بۆ یەکخستنی شێوەزمانی ئەدەبیی کرمانجی دابڕێژن، کار بۆ یەکخستنی ئەو زمانە پێشخستن و چەسپاندنی بکەن.

## بەستانداردکردنی زمانی کوردی

هیچ نەتەوەیەک نییە کە زمانەکەی لە چەندان دیالێکت پێک نەهاتبێت؟ بەڵام هیچ نەتەوە و حکومەتێک، لە هیچ وڵاتێکی دنیادا، کە بەتەنگ یەکبوون و داهاتووی خۆیانەوە بوون، ڕێگەیان نەداوە و ڕێگەیش نادەن، بە ناوی دیموکراسی و مافی مرۆڤەوە، دیالێکتێک، یان چەند دیالەکتێکی، زمانەکەیان خۆیان بکەنە ئەلتەرناتیڤ (بەدیل)ی زمانی دەوڵەت و حکومەت و دەزگاکانی. ئەگەر نەتەوە مۆدێرن و خاوەن دەوڵەتەکان، بە دەوڵەتە دیموکراتەکانیشەوە، بەرگەی ئەوە نەگرن کە زمانەکەیان بکرێتە چەند زمانێک، ئایا نەتەوەیەکی خێڵەکیی ژێردەستی وەک کورد، کە هێشتا دوژمنانی نکوڵی لە بوونی نەتەوەیی و زمانەکەی دەکەن، چۆن بەرگەی لەتکردنی زمانەکەی دەگرێت؟

گەلی باشووری کوردستان هێشتا لە نێو کەشتییەک دایە کە خۆی و سەرکردایەتییە سیاسییەکەی نازانن بەرەو کوێ (نقومبوون یان کەناری ئازادی) دەچێت. کەواتا بۆچی و لەبەرچی لەو دۆخە ناسک و تەماوییەدا شەڕی دیالێکتەکان بەرەو ڕووی ئەو گەلە و حکومەتەکەی دەکرێتەوە؟

دیاردەی فرەدیالێکتی، لە باشووری کوردستان، لەجیاتی ئەوەی شۆڤێنیزمی لەهجەیی و گیانی ناوچەپەروەری بەرهەم بهێنێت و فاکتەری لێکدابڕانی نەتەوەیی بێت، دەتوانێت لە ڕێی سیاسەتێکی ژیرانەی زمانی و کولتوورییەوە، بکرێتە سامانێکی کولتووریی گرنگ و مایەی دەوڵەمەندیی کولتووری و ڕووناکبیریی بێت.

سیاسەتی زمانی بەشیکی گرنگی سیاسەتی نێوخۆی هەر حکومەت و دەوڵەتێک پێک دێنێت. زۆر نەتەوە، دوای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، دەیان ساڵ هێز و تواناکانی دەوڵەت و توانا و لێهاتوویی زانایانی زمان و سامانێکی زۆریان، بۆ پێکهێنانی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و بەستانداردکردنی تەرخان کردووە. ئێمە، لە باشووری کوردستاندا، زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی چەسپاومان هەیە، کە بەلای کەمەوە لە دوای شەری یەکەمی جیهانی و دامەزراندنی حکومەتی (شێخ مەحموود)ەوە، لێهاتووانە رۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێت. ئەم زمانە لە رەوشی مێژوویی خۆیدا بەردەوام گەشەی کردووە. بە هۆی ئەو رۆڵە گرنگەی لە ژیانی نەتەوەدا بینیویەتی، ستاتوسی زمانی ستانداردی پەیدا کردووە و تەنیا پێویستی بە بریارێکی سەرکردایەتیی سیاسی، یان پەرلەمانی کوردستان هەیە تا، لە باشووری کوردستاندا، بە رەسمی بە زمانی ستانداردی کوردی بناسرێت. ناشێت لەوە زیاتر ئەم مەسەلەیە، بە ناوی دروستکردنی زمانێکی ستاندارد بۆ هەموو کورد، دوابخرێت.

دروستکردنی زمانێکی ستاندارد بۆ هەموو کورد (بە تێکەڵکردنی کوردیی خواروو- ناوەراست لەگەڵ کوردیی سەروو- بادینی) کارێکی سەخت و تەنانەت مەحاڵیشە، چونکە ئەم دوو شێوە زمانە، لە رووی رستەبەندی و رێزمانەوە جیاوازیی زۆریان هەیە، بۆیە ناکرێت لە هەردووکیان زمانێکی نوێ(*) پێکبهێنرێت. ئەو هەولانەی کە تا ئێستا لەو بارەیەوە دراون و لەسەر مندالانی بەدبەختی کوردستان تاقی کراونەتەوە، تێکەڵکردنێکی میکانیکییانە و کاریکاتێرییانەن. ئەوانەی تۆزێک ئاگاداری زانستی زمان و تایبەتمەندیی زمانی کوردی و مێژووی پێکهاتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و زمانی ستانداردی گەلان بن، دەزانن ئەمە کارێکی نەزانانە و نەفامانەیە و هیچ بنەمایەکی زانستیی زمانیی نییە و بێ ئەنجامە. چونکە زمانی ستاندارد بە مەیل

و ئارەزووی چەند کەسێک و بە بڕیاری سیاسی دروست ناکرێت. بڕیاری سیاسی دەتوانێت زمانێکی ئەدەبی، کە بە جۆرێکی سروشتی لە رەوشی پێشکەوتنی مێژوویی نەتەوەدا پێک هاتووە و توانا و لێهاتووی خۆی دەرخستووە، بە زمانی ستاندارد بناسێنێت و بیسەپێنێت.

پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، نوێنەرایەتی گەل و هەرێمی کوردستان دەکەن. نەک هەموو گەلی کوردستان. سیاسەتی خۆیشیان بە پێی ئەو بنەمایە دارشتووە. ئایا پەرلەمان و حکومەتی هەرێم، مافی ئەوەیان هەیە، لە ئاستی سیاسەتی زمانیدا، کە بەشێکە لە سیاسەتی نێوخۆ، لەجیاتی هەموو کورد، بڕیار بدەن و زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی نوێ بۆ تێکڕای نەتەوە دابتاشن؟ پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، ناتوانن لە تاقیگە و کارخانەدا، زمانێکی ئەدەبی نوێ دروست بکەن. خۆ ئەگەر گریمان، لە تواناشیاندا بێت ئەم کارە بکەن، کە وا نییە، هێشتا ناتوانن بە سەر هەموو کورددا بیسەپێنن. چونکە سەپاندنی زمانێکی ستاندارد، لە هەموو کوردستاندا، پێویستی بە دەسەڵاتێکی سیاسی، هەیە کە هەموو کوردستان بگرێتەوە. هەر کاتێک گەلی باکووری کوردستان و زمانەکەی ئازاد بوون، تەنیا ئەوان خۆیان دەتوانن بڕیار بدەن کە ئەو شێوەزمانە ئەدەبییەی کرمانجی، کە پشت بە دیالێکتی جزیرە دەبەستێت، بەرەو خەملاندن دەچێت، دەکەنە زمانی ستاندارد، یان دیالێکتی هەرکاری، کە مێژوویەکی دێرینتری هەیە و لە نووسینیشدا بەکار دەهێندرێت..تاد). یاخود زۆرینە زمانی تورکی وەک زمانی هاوبەش هەڵدەبژێرن. ئەی چی لە دیالێکتی زازا دەکرێت؟ کە زیاتر لە چوار ملیۆن کوردی باکوور پێی دەدوێن و لە ئەورووپا و باکووری کوردستان پێی دەنووسرێت. جیاوازیی ئەم دیالێکتە لەگەڵ

دیالێکتەکانی کرمانجیی سەروودا زۆر لە جیاوازیی نێوان بادینانی و کوردیی ناوەڕاست و خواروو زیاترە.

لە بەر ئەم هۆکارانە و زۆری تر، ناکرێت مەسەلەی دروستکردنی زمانێکی ستاندارد بۆ هەموو کورد، سیاسەتی زمانیی حکومەتی هەرێم پەک بخات. بە رای من کاتی ئەوە هاتووە کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، بە بڕیارێکی سیاسی، وەک زمانی ستانداردی کوردی، لە باشووری کوردستاندا، بناسرێت. یاسا و دەزگایەکی تایبەتی زمان بۆ پاراستن و پێشخستنی دابندرێت. چونکە ئەم زمانە، وەک پێشتر وتمان، بە کردەوە و بە جۆرێکی سروشتی، لە نووسین و خوێندن و سیاسەت و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمدا رۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێت و پەرلەمان و سەرۆکایەتیی هەرێم و حکومەت هەرئەو زمانە ئەدەبییە بەکار دەهێنن و وتاری رەسمی دەدەن. لە هەمان کاتدا دەزگای زمانی کوردی (ئەگەر دروست بکرێت) و ئەکادیمیای کوردی، دەتوانن بە هاوکاریی شارەزایان و زانایانی زمانی کوردی، پلانی درێژخایەن و ستراتیجی، بۆ زمانی کوردی و رەوشی گەشەکردنی دابنێن، کۆنفرانس و سیمیناری تایبەت رێک بخەن، توێژینەوەی زانستییانە بۆ نزیککردنەوەی هەردوو شێوەزمانی کوردیی باشوور و ناوەڕاست و کوردیی باکوور ئامادە بکەن، تاکوو خەڵکی کورد، بە هەر شێوەزمان و دیالێکتێک بدوێن، ئاسانتر لە یەکتر بگەن و پەیوەندیی کولتووری و زمانییان بەهێز ببێت. هەروا حکومەتی هەرێمی کوردستان دەتوانێت یارمەتی گەلی باکووری کوردستان بدات، تا زمان و کولتوورەکەیان لە کوژران و نەمان بپارێزن و گەشەیان پێ بدەن.

دواجار گرنگە دووپاتی بکەینەوە کە زمانی ستاندارد دیالێکتەکان لەناو نابات. بە پێچەوانەوە دیالێکتەکان، لە سایەی بوون و

گەشەکردنی زمانی ستانداردددا و لە ڕێگای سیاسەتێکی ژیرانەی زمانییەوە دەتوانن پارێزراو بن و زەمینەی مانەوە و گەشەکردنیان بۆ دەستەبەر بکرێت. هەر دیالێکتێکیش، لە ڕێی ئەو تێکست و بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەی پێی بەرهەم دەهێندرێت، دەتوانێت گەشە بە خۆی بدات و ئازادانە توانای خۆی پیشان بدات، جێگای خۆی لە کۆمەڵدا بکاتەوە، بێ ئەوەی شەڕی زمانی ستاندارد بکات، یان بەهێزبوونی خۆی لە لاوازکردنی زمانی ستانداردددا ببینێ

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

1 - Benedict Anderson, Den föreställda gemenskapen, Översättning: Sven-Erik Torhell, Daidelos, Göteborg 1993, s.78
2 - Karl Popper, Det Öppna samhället och dess fiender, , Del 2, Översättning av Bo Ekström, Akademilitteratur, Stockholm 1981, s.58
3 - Öyvind Österud, vad är nationalism, Stockholm 1997, s.30
4 - Tore Jonson, Språket och historian, Norstedts, Falun 1997, s.152
5 - Öyvind Österud, s.34
6 - Michael Norberg, Asiens historia från forntiden till 1914, Natur och kultur, Stockholm 1971, s.108-109
٧- م. ئە. حەسرەتیان، یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، وەرگێڕانی لە رووسییەوە د. دلێر ئەحمەد، بڵاوکراوەی مەلبەندی کوردۆلۆجی لە هەرێمی کوردستان ٢٠٠٧ لا. ٢١
8 - Jasenka Trakt, Språk och statbildning, multietniska, Nr 24-25, aug.1999,s.3
9 - Ingmar Söhrman, Språk, nationer och andra farligheter, ARE-NA, 1997, s.27
10 - Tore Jonson, Språket och historian, s.20
١١- پێشتر لە کتێبی (ئیمپراتۆریای لم)و (کولتوور و ناسیۆنالیزم)دا فراوانتر باسی ئەم مەسەلەیە کراووە. هەروا بۆ زیاتر بڕوانە: د. عیزەدین مستەفا رەسوول، زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، بەغدا (١٩٧٠)
١٢- ناونانی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی بە سۆرانی پەیوەندیی بە میرنشینی سۆرانەوە نییە، چونکو وئەم زمانە ئەدەبییە (وەک زمانی نووسین) سەرەتا لە ناوچەی سلێمانی و لە سایەی میرنشینی باباندا دەرکەوت. دواتر بە ناوچەو هەرێمەکانی (گەرمیان، سۆران، هەورامان، موکریان و سنە)دا بڵاو بۆوە. بە پێی ئاگاداری نووسەری ئەم باسە، وشە، یان زاراوەی سۆرانی، کە بە سەر زمانی کوردیی خواروو و خەڵکەکەیدا بڕاوە، سەرەتا لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی رابردوودا و لە کاتی شەڕی نێوخۆدا، لە زاری بادینانییەکانەوە، کەوتە سەر زمانی خەڵک. ناوچەی سۆران، کە خەڵکەکەی بە شێوەزمانی کوردی خواروو دەدوێن، سنووری لەگەڵ بادینانە. بۆیە وشەی سۆرانی، لای هەندێک خوێندەوار و نەخوێندەواری بادینان، وەک پێناسەیەک بۆ ئەو کوردانە بەکار هاتووە، کە بە دیالێکتی بادینانی نادوێن. بە کورتی وشەی (سۆرانی) وەک پێناسەی کۆمەڵە

خەڵکێک لە بەرامبەری پێناسەی بادینانیدا دروست کراوە. چونکوو ئەوانەی بە زمانی ئەدەبیی کوردیی خواروو دەدوێن، نە خۆیان بە سۆرانی دادەنێن و نە شێوە زمانەکەیان بە سۆرانی ناو دەبەن. ئەوان تەنیا خۆیان بە کورد و زمانەکەیان بە کوردی دەزانن. خەڵکی بیانیش (عەرەب ئەوروپایی و ئەمریکایی) ئەوان بە کورد دەزانن. بەلام کوردی باکووری کوردستان، بە گشتی خۆیان بە کرمانج و زمانەکەیان بە کرمانجی ناو دەبەن. کەچی کوردی باشوور و رۆژهەلاتی کوردستان ئەوان بە کورد و زمانەکەشیان بە کوردی دەزانن. وشەی (سۆرانی) دواتر، لە گەڵ بەردەوامبوونی شەڕی نێوخۆدا، مانایەکی نێگەتیڤی وەرگرت. بۆیە ناوبردنی زمانی ئەدەبیی کوردی و ئەو خەڵکەی پێی دەدوێن و دەنووسن بە سۆرانی، بە مەبەست یان بێ مەبەست بێت، تەنیا هەڵە نییە، بەڵکو تەوهین و سوکایەتیکردنیشە.

١٣- د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی ئەدەبی، بەشی سێیەم، ئاسۆ، ژمارە ٤٥١،رۆژی٦-٦-٢٠٠٧

١٤- ئەم قسەیەم لە بەڕێز د.مەحموود عوسمان، ئەندامی پێشووی مەکتەبی سیاسیی پارتی بیستووە.

١٥- لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

-Johanna Barodal & Nils Jörgensen, Nordiska Våra Språk förr och Lund, 1997

Ingmar Söhrman, Språk, nationer och andra farligheter, - ARENA, 1997, s.27

- Tore Jonson, Språket och historian, Norstedts, Falun 1997

16_ Hug Ryden, Dick Widing, Språk orientering, Sverige, s. 56

Ingmar Söhrman, Språk, nationer och andra farligheter,s.28 17-

* هەندێک بۆ گاڵتە، ئەم شێوەزمانە! بە سورمانجی (سۆرانی- کرمانجی) ناو دەبەن.

## ئەلفوبێی كوردی

هەر زمانێک کە لە زمانی ئاخاوتنەوە دەگۆڕدرێت بۆ زمانی نووسین، سیستمی نووسینی خۆی و ئەلفوبێی تایبەتی خۆی هەڵدەبژێرێت، یان دادەهێنێت. کاتێک زمانانی گەلانی ئەورووپای رۆژئاوا، بوونە زمانی نووسین، ئەلفوبێی لاتینی بەکار هێنرا. چونکە ئەو سەردەمە و پێشتریش زمانی لاتینی، زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و زمانی ستانداردی ئەو وڵاتانە بوو. ئەم زمانە و ئەلفوبێیەکەی لە کڵێسا و خوێندنگاکانی سەر بە کڵێسادا، کە ناوەندی بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی بوون، دەخوێندران. زمان و ئەلفوبێیەکی دیکە نەبوون، کە لە سیستمی خوێندندا مونافەسەی لاتینی بکەن. کاتێک زمانی نەتەوەیی ئەو وڵاتانە، وەک زمانی نووسین و خوێندن و دەوڵەت دەرکەوتن و گەشەیان کرد، جێگای زمانی لاتینییان گرتەوە. ئەوەی لە زمانی لاتینی بۆ ئەو نەتەوانە مایەوە، ئەلفوبێیەکەی و بە هەزاران وشە و زاراوەی گرنگی فیکری، فەلسەفی، ئەدەبی و زانستی بوون. بەڵام ئەلفوبێی لاتینی، لە هەر وڵاتێکدا، تایبەتمەندیی خۆی وەرگرت و بە پێی سیستمی دەنگ (فۆنێتیک) و سیستمی نووسین بە زمانی ئەو نەتەوانە هەموار کرا. لە ئەلفوبێی هەموارکراوی لاتینییەوە، ئەلفوبێی (ئینگلیزی، فرانسی، ئەڵمانی، سویدی، دانمارکی...تاد) پەیدا بوون. زۆربەی گەلانی سلاڤی ئەلفوبێی کیریلی (سیریلی)یان بەکار هێنا، کەچی ژاپۆنییەکان، کە زمانەکەیان گۆڕدرا بە زمانی نووسین، بە کارتێکردنی زمان و کولتووری چینی، هەیرۆگلیفی چینییان هەڵبژارد.

زمانی کوردی، لە کۆتایی سەدەی شانزەیەمدا، لە زمانی ئاخاوتنەوە گۆڕدرا بە زمانی نووسین. ئەم گۆڕانکارییە سەرەتای دەرکەوتنی هەستی خۆناسینی کولتووری و ئیتنیکی لای رووناکبیرانی ئەو کاتەی کورد پیشان دەدات. ئەوان ویستیان لە ڕێی نووسین بە زمانی کوردی و تایبەتمەندیی زمانەکەیانەوە، خۆیان لە عەرەب و فارس و تورک جیا بکەنەوە. (ئەحمەدی خانی) لە مەم و زیندا، باس دەکات کە بۆچی شاکارەکەی خۆی بە کوردی، نەک عەرەبی، یان فارسی، کە زمانی باوی ئەو سەردەمە بوون، نووسیوە:

دا خەلق نەبێژن کو ئەکراد
بێ مەعریفەتن ، بێ ئەسڵ و بونیاد
ئەنواعی میلەل خودان کتێبن
کرمانج تەنێ دبێ حسێبن
هەم ئەهلی نەزەر نەبێن کو کرمانج
عیشقێ نەکرن ژ بۆ خۆ ئامانج[1].

هەڵبژاردنی ئەلفوبێی عەرەبی-فارسی (کە بە ئەسل ئارامییە) بە جۆرێکی سروشتی لەگەڵ پەیدابوونی نووسینی کوردی و زمانی ئەدەبیی کوردیدا پەیدا بوو، چونکە ئەو کاتە خوێندن و خوێندەواری، لە کوردستاندا، بە زمانی عەرەبی و فارسی بوون. ئەم ئەلفوبێیە، دواتر لە نووسینی کوردیدا (بە هەمان شێوەی ئەلفوبێی لاتینی، لای گەلانی رۆژئاوای ئەورووپا) هەموار کرا. کۆمەڵە تیپێکی نوێی بۆ زیاد کرا و کۆمەڵێکی دیکەی لێ لابرا و بە تەواوی لەگەڵ سروشت و تایبەتمەندیی زمانی کوردیدا گونجێندرا. لە نێو ئەو گەلانەی کە ئەم جۆرە ئەلفوبێیە بەکار دەهێنن، کورد، لە رێنووسەکەیدا، توانیویەتی لە هەموویان باشتر ئەلفوبێیەکە لەگەڵ سروشت و تایبەتمەندیی زمانەکەیدا بگونجێنێت و هەمواری بکات. دەنگە تایبەتەکانی زمانی کوردی (ئە،پ، چ،ڕ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ، ێ) تیپی سەربەخۆیان بۆ

داندراون. کەچی هەندێک لەم دەنگانە، کە لە هەندێک وشە و ناوی بیانیدا دووبارە دەبنەوە، هێشتا لە نووسینی عەرەبی و فارسی و دەریدا جێگایان نەکراوەتەوە.

لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمەوە دەنگە بزوێنەکانی زمانی کوردی، لە جیاتی سەر و بۆر و ژێر (فەتحە و زەممە و کەسرە)ی عەرەبی، وێنەی تایبەتیان بۆ داندراون. ئەمەیش تایبەتمەندیی زمان و ڕێنووسی کوردی و دینامیزمی پێشکەوتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەر دەخات. وشەی کوردی چۆن دەگوترێت ئاوەهایش دەنووسرێت. کەچی هێشتا زۆربەی ئەو زمانانەی تر، عەرەبی و فارسی و دەری ، کە بە هەمان ئەلفوبێ دەنووسرێن، لە خوێندنەوەدا گرفتی جیدی بۆ خوێنەر، بە تایبەتی بۆ خوێندکاری سەرەتایی و کەسانی بیانی، کە ئەو زمانانە فێردەبن، دروست دەکەن. چونکە لە نووسینی ئەو زمانانەدا زۆربەی دەنگە بزوێنەکان (ڤاوڵەکان) بە تیپی تایبەت نانووسرێن. ئەمەیش جیاوازییەکی گەورەی لە نێوان شێوەی نووسینی وشە و وتنیدا دروست کردووە. ئەگەر مرۆڤ مانای وشەکە نەزانێت، زۆر زەحمەتە بە دروستی وشەکە، وەک خۆی، بخوێنێتەوە، چ جای ئەوەی لێی تێ بگات. کەچی لە نووسینی کوردیدا ئەم جۆرە گرفتانە نین، ئەمەیش لە لایەکەوە گونجان و هارمۆنیای نێوان زمانی کوردی و ئەلفوبێیەکەی پێشان دەدات، بەو پێیەی ئەلفوبێی کوردی لایەنێکی گرنگی زمان و پێناسە (ئایدێنتیتی)ی کولتوورییمان پێک دێنێت. لە لایەکی دیکەوە توانای گۆڕان و پێشکەوتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەر دەخات. بۆیە مرۆڤ دەتوانێت، بە بێ هیچ سلکردنەوەیەک، باسی ئەلفوبێی کوردی بکات و ئەم ئەلفوبێیەی لە نووسینی کوردیدا بەکار دێت بە ئەلفوبێی کوردی ناو ببات، هەر بەو جۆرەی ئەڵمانێک و سوێدییەک و فەرەنسییەک ..تاد باسی ئەلفوبێی زمانەکەیان دەکەن.

(ئەلفوبێی کوردی هەر ئەوە نییە کە جوانە، یان بۆ نووسینی دەنگەکان لەبار ترە، بەڵکە ئەوەیشە کە دوای سەدان ساڵ بەکارهێنانی بۆتە گەنجینەی پاراستنی ئاوەز و بیر و هۆش و فەرهەنگ و شارستانەتیی کورد. هەر وەک ئەو داوە زێڕینەیشە کە فەرهەنگی کورد و فەرهەنگی بەشی هەرە زۆری گەلانی رۆژهەڵات پێکەوە گرێ دەدات و لە مەودایەکی مێژوویی و فیکری و شارستانەتیدا دەیانکاتە یەکەیەکی مەعنەوی و سیاسی. هەر بڕیار و هەر گۆڕانێک کە بیەوەی ئەلفوبێی لاتینی بەسەر زمانی کوردیدا بسەپێنێ دوژمنایەتیکردنی ئاشکرای یەکێتیی کورد و فەرهەنگ و زمانەکەیەتی)[٢].

کەواتا بۆچی هەندێک رووناکبیری کوردی باکوور، کە دەوڵەتی تورک زمان و ئەلفوبێی کوردیی لێ یاساخ کردوون، هێندە ئەلفوبێی لاتینی-تورکییان لەلا پیرۆزە کە داوا دەکەن ئەلفوبێی کوردی، بە ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بگۆڕدرێت؟ ئەوان کە ناتوانن تاکە رستەیەک بە ئەلفوبێ کوردی بخوێننەوە و لەو سامانە کولتوورییە بێ ئاگان، کە چوارسەد ساڵە بەو ئەلفۆبێیە نووسراوە، چۆن و بە چ مافێک دەتوانن داوا بکەن کە کوردی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان هێندە بە ئاسانی، دەستبەرداری ئەلفوبێکەی خۆیان و سامانە کولتووری و رووناکبیرییەکەیان ببن و بە چاولێکەری لە دەوڵەتی رەگەزپەرستی تورک، ئەلفوبێی خۆیان بگۆڕن؟ ئەوان بە زەبری تیرۆری دەوڵەت دەستبەرداری ئەلفوبێی کوردی کراون و تا ئێمڕۆ ناتوانن لە دەسەڵات و کاریگەریی کولتووری کەمالیزم و عاقیبەتەکانی رزگار ببن، کەچی دەیانەوێت کوردی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان ئارەزوومەندانە، ویستی کەمالیستەکان جێبەجێ بکەن و واز لە ئەلفوبێی خۆیان بهێنین، کە بۆتە بەشێکی بنەڕەتیی ژیانی کولتووری

و ڕووناکبیری و خوێندەواریی کورد. سەیرە کەسێک ماڵی سووتێندرا بێت و سامانە کولتووری و ڕۆحییەکەی وێران کرابێت، لە جیاتی ئەوەی بێت داوای کۆمەک بکات تا ماڵ و سامانەکەی بنیات بنێتەوە، کەچی داوا لە خەڵکی تر دەکات بە دەستی خۆیان، ئاگر بەربدەنە ماڵەکەیان و سامانی کولتووری و ڕۆحیی خۆیان وێران بکەن، تا ئەمانیش وەک ئەویان بەسەر بێت!! ئەگەر ئەمە نەفامی و نەزانی نەبێت ئەوا بە دڵنیاییەوە بیرکردنەوەیەکی کەمالیستانەیە، چونکە کەمالیزم، لە ماوەی دەیان ساڵی پرۆپاگەندەکردنی چەواشەکارانە، توانیویەتی ئەلفوبێی لاتینی- تورکی لای تورک و کوردی باکوور، وەک یەک، پیرۆز بکات و ئەو وەهمەیان لەلا دروست بکات،کە ئەوان بە گۆڕینی ئەلفوبێی زمانەکەیان بە ئەورووپایی بوون!

# ئەلفوبێی لاتینی- تورکی

ئەلفوبێی لاتینی-تورکی، وەک پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، پرۆژەی ناسیۆنالیزمی تورک بوو. لە ساڵی ١٩٢٤دا کاتێک دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک دامەزرێندرا، ئەو ئەلفوبێیە بە سەر گەلانی تۆرکیادا سەپێندرا. دواتر، هەمان ئەلفوبێ، یەکەم جار لە نووسینی کرمانجیدا، لە ڕێی گۆڤاری هاوارەوە (١٩٣٢-١٩٤٣) دەرکەوت، کە جەلادەت بەدرخان لە ئێکسیل (سوریا) دەری دەکرد[٣].

بە ستانداردکردنی ئەو ئەلفوبێیە لە تورکیادا، بەرهەمێکی تری ئایدیۆلۆجیای کەمالیزمە. دەوڵەتی کەمالیستی تورکیا، بە هۆی خۆبەکەمگری لە بەرامبەر ئەورووپا و ئیدیعای ئەورووپاییبوونی تورک و بە مەبەستی بەتورککردنی گەلانی نێو تورکیا و کوشتنی زمانەکانیان، ئەو ئەلفوبێیەی لە تورکیادا سەپاند. لەگەڵ ئەلفوبێیەکەدا دیالێکتی تورکیی ئەستەمبوولی کرایە زمانی ستانداردی تورکی، سەرەڕۆیانە و بە زۆر بەسەر گەلانی تورکیادا سەپێندرا. بەم کارە، دەوڵەتی تورکیا، هەموو نەتەوەکانی نێو تورکیای لە ڕیشەی کولتووری و ئەدەبی و رابردووی مێژوویی خۆیان دابڕی و بەو کولتوور و رابردووە مێژووییە نامۆی کردن. ئەمەیش بەشێک بوو لە ئامانجەکانی کەمالیزم، کە دەیەویست گەلانی کورد، عەرەب، لاز، چەرکەس و گورجی..تاد، بە تورک بکات و نەتەوەیەکی نوێی تورک، لە نێو سنووری تورکیادا، دروست بکات.

دوای سەپاندنی ئەو ئەلفوبێیە و زمانی تورکی، وەک تاکە زمانی رەسمیی دەوڵەت، پرۆسێسی بە تورککردنی ئەو گەلانە و کوشتنی زمان و کولتوورەکەیان دەستی پێکرد. ئەم کارەیش بە هێزی دەستوور و قانوون و لە رێی زەبروزەنگ و تیرۆری دەوڵەتەوە جێ بەجێ کرا.

لە نیسانی ساڵی ١٩٢٤دا ئەنجومەنی بەرزی نیشتمانیی تورک، یەکەمین دەستووری تورکیای پەسند کرد. لە مادەی هەشتاوهەشتەمی دەستوورەکەدا هاتووە (هەموو دانیشتوانی تورکیا بەبێ جیاوازیی ئاینی و نەژاد، گشتیان تورکن.[٤] بە پێی مادەی دووەمی ئەم دەستوورە، وەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، زمانی تورکی بە تاکە زمانی رەسمی و دانپێدانراوی تورکیا داندرا. هەروا کاتێک کورد لە رووی سیاسەتی کوشتنی زمانەکەی و تواندنەوەی نەتەوەییدا رابوو، دەوڵەتی تورک، لە ریی کوشتاری بە کۆمەڵی کوردەوە، کوشتنی زمان و کولتووری کورد (کولتوورسایدئ)ی گۆڕی بە جینۆسایدی کورد. ئەم سیاسەتەی دەوڵەتی تورک، بەرهەمی ئایدیۆلۆجیایەکی رەگەزپەرستانە بوو، بەڵام بە مۆدێلی تورکی. چونکە تورک رەگەزپەرستیی لە دیاردەیەکی بایۆلۆجییەوە گۆڕی بە دیاردەیەکی زمانی و کولتووری.

رەگەزپەرستی لە ئەوروپادا، لە ئەنجامی پەیدابوونی کۆلۆنیالیزم، وەک دیاردەیەکی بایۆلۆجی دەرکەوت. ئایدیۆلۆجیای رەگەزپەرستی (راسیزم) رەگەزی سپی-ئەوروپایی بە بەرز و زیرەک و داهێنەر ویناکرد و رەگەزەکانی تریشی بە دواکەوتوو، بیدایی (پریمیتیڤ) و گەمژە دانان. پرۆسێسی کۆلۆنیالکردنی وڵاتان و ژێردەستکردنی ئەو گەلانەیش، ناوی بەشارستانکردن و پێشخستنی ئەو خەڵکە (پریمیتیڤ و وەحشییانە)ی لێ نرا.

دەوڵەتی تورک ئەو فۆرمەی رەگەزپەرستی بایۆلۆجی گۆڕی بە رەگەزپەرستیی زمانی (لینگڤیسیزم) . ئەوەی تورک نەبوو و زمانەکەی تورکی نەبوو بە دواکەوتوو، گوندی، تورکی شاخی، بیدایی و وەحشی وینا کرا. بۆ ئەوەی ئەو (وەحشی و دواکەوتووانە) بە شارستان بکرێن و پێش بخرێن، دەبوو فێری زمانی تورکی بکرێن و شەرمیان بە زمانەکەی خۆیان بێت و فەرامۆشی بکەن. هەموو دەزگاکانی دەوڵەت بۆ گەیاندن و سەرخستنی ئەم سیاسەتە رەگەزپەرستییەی دەوڵەتی تورک، بەگەڕ خران. ئاشکرایە سیستمی پەروەردە و قوتابخانەکان، باشترین جێگابوون بۆ پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە و شوشتنەوەی مێشکی منداڵانی کورد. بەڵام لە زۆر ناوچەی باکووری کوردستاندا لە جیاتی ئەوەی مامۆستاکان بچنە گوند و شارۆچکە دوور و دواکەوتووەکانی کوردستان، دەوڵەت قوتابیانی لە کەس و کاریان دوور دەخستەوە و دەیبردن بۆلای مامۆستا تورکەکان و لە خوێندنگەی تایبەتدا، کە بە چەندان مانگ چاویان بە دایک و باوکیان نەدەکەوت، وەک دەستبەسەر دەژیان، لەوێ بە تورک دەکران. نووسەری کۆچکردووی کورد، مەحموود باکسی، لە کتێبێکدا کە ساڵی ۱۹۷۹ بە زمانی سوێدی بڵاو کراوەتەوە، بەم جۆرە باسی ژیانی خۆی لە قوتابخانەیەکی تورکیادا دەکات:

(ساڵی ۱۹٦۲ من تەمەنم حەوت ساڵان بوو کاتێک لەگەڵ خوشکم، کە ساڵێک لەمن گەورەتر بوو، دەستمان بە خوێندن کرد. ئەو کاتە ئێمە یەک وشەی تورکیمان نەدەزانی. بۆیە لە ساڵانی سەرەتادا هەستمان دەکرد کە بەتەواوی لاڵین. هەروا بۆمان نەبوو، لە کاتی پشوودا، بە کوردی قسە لەگەڵ یەکتر بکەین. دەبوو بێدەنگانە پێکەوە بە بەرد و شتی لەو جۆرە یاری بکەین. مامۆستاکان بە بەردەوام، لە حەوشەی قوتابخانە، چاودێرییان دەکردین. هەر کەسێک

به کوردی دەپەیڤی سزا دەدرا: مامۆستاکان بە راستە لە سەرپەنچە و سەرمانیان دەدا. ئەو لێدانە ئازارێکی یەکجار زۆری هەبوو. لەبەر ئەوە ئێمە بەردەوام لە قوتابخانە دەترساین و نەمان دەویست بچینە قوتابخانە) [٥].

ئەو خوێندکارانە بە درێژایی ساڵ و ساڵان، لە خوێندنگا تایبەتەکاندا، لە کەسوکاریان دادەبڕان و بەتورک دەکران. دواتر ئەوان کەسوکاری خۆیان نە دەناسییەوە. (منداڵەکان بۆیان نەبوو لە قوتابخانەدا بە کوردی قسە بکەن. ئەوان فێر دەکران کە کورد چەپەڵ و بیدایین (پریمیتیڤن). کاتێکیش منداڵەکان بە سەردان، بۆ گوندەکانیان دەچوونەوە، بە دایک و باوکیان دەوت کە ئەوان تورکن، دایک و باوکێکی پریمیتیڤی کوردیان ناوێت، بەڵکو دەیانەوێت کە دایک و باوکیان بە تورکی قسان بکەن و خۆیان بە شارستانی بکەن) [٦].

بەو شێوە رەگەزپەرستانە و لە سەخترین دۆخی سیاسی و کولتووریدا، زمانی تورکی و ئەلفوبێی لاتینی بەسەر گەلی باکووری کوردستاندا، سەپێندران. زمانی کوردی، کە لە تورکیا یاساخ کرابوو، تەنیا لە تاراوگە (ئێکسیل) و بە دوور لە گەلی باکووری کوردستان، دەرفەتی بەردەوامبوونی بۆ مابۆوە. بەدرخانییەکان لە سوریا خەباتی رووناکبیری و سیاسیی خۆیان، لە دژی دەوڵەتی توکیا درێژە پێ دا. ئەوان، بەلای زۆرەوە، ناچار بوون کە بڵاوکراوەکانیان بە ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بنووسن، چونکە لەو ماوەیەدا نەوەیەکی نوێی خوێندەواران لە باکووری کوردستاندا دەرکەوتبوون، کە تەنیا بەم ئەلفوبێیە دەیان توانی بخوێننەوە. بە رای من لەبەر ئەم هۆکارە پراگماتییە بوو، نەک هۆکاری زمانی، کە هێژا (کامەران بەدرخان) و هاورێکانی لە مەنفادا کەوتنە بەکارهێنانی ئەم ئەلفوبێیە نوێیە. چونکە پێشتر لە سەدەی شازدەیەمەوە تا دامەزراندنی دەوڵەتی کەمالیستیی

تورکیا، لە ئەدەبییات و نووسینی کوردی و بڵاوکراوە و گۆڤارەکانی باکوور و باشووری کوردستان (لەوانە ڕۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری هێڤی کورد، پەیام، ڕۆژی کورد..تاد) تەنیا ئەو ئەلفوبێیە کوردییە بەکار هێندراوە. پێشتریش (مەلای جزیری، خانی، فەقێ تەیران، عەبدولرەزاق بەدرخان) لە باکووری کوردستان، (مەولەوی، نالی، وەفایی، حاجی قادری کۆیی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی و مەحوی..تاد) لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەر بەو ئەلفوبێ کوردییە نووسیویانە.

ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بە جۆرێکی سروشتی نەهاتە ناو نووسینی کوردییەوە، لە ڕەوشێکی ئاسایی مێژووییدا تێکەڵاوی کولتوور و بیر و هۆشی کورد نەبوو، بەڵکو لە گەرمەی کۆلۆنیالکردنی باکووری کوردستان و هەوڵی کوشتنی زمانی کوردی و بە ئامانجی نامۆکردنی کورد، لە رابردووی مێژوویی و کولتووری و ئەدەبیی خۆی، بەسەر کوردی باکووری کوردستاندا سەپێندرا. واتا ئەو ئەلفوبێیە لە دەرەوەی ویست و ئیرادەی کوردەوە هات. بۆیە وەک هەر دیاردەیەکی کولتووری، کە لە دەرەوەرا و بە پاڵپشتی دەسەڵاتێک بێتە وڵاتێکی تر، هیچ بایەخێک بە تایبەتمەندیی کولتووریی وڵاتەکە نادات. لە جیاتیان دەیەوێت خۆی و بایەخ و تایبەتمەندیی خۆی بسەپێنێت.

ئەلفوبێی لاتینی، لە بنەڕەتدا لەگەڵ دەنگەکانی زمانی تورکیدا هەموار کراون و وێنەی تایبەتی دەنگەکانی زمانی تورکییان بۆ داندراوە و سەرەنجام بوونەتە ئەلفوبێی تورکی، یان لاتینی هەموارکراوی تورکی. زمانی کوردی و گەرووی مرۆڤی کوردی باکوور ناچار کراون لەگەڵ ئەم ئەلفوبێیە تورکییەدا بگونجێندرێن. بۆیە ئەلفوبێی لاتینی تورکی بۆ کورد سیمبوول و هاوواتای

(سینۆنیم)ی کوشتنی زمان و کولتووری کوردییه.

بەکارهێنانی ئەلفوبێ لە نووسیندا، بە هەر زمانێک و بە هەر ئەلفوبێیەک بوو بێت، بە جۆرێکی سروشتی، لەگەڵ گۆڕانی زمان، لە پەیڤینەوە بۆ نووسین، دەردەکەوێت. بۆیە ئەلفوبێیەکە لەگەڵ سروشت و تایبەتمەندیی دەنگەکانی زمانەکەدا دەگونجێندرێت. کەچی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی- تورکی، لە باکووری کوردستاندا، پێچەوانەی ئەم ڕێسا سروشتییەیە، چونکە زمانی کوردی و گەرووی مرۆڤی کوردی باکووری کوردستان، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەلفوبێیەکەدا بگونجێندرێن، بە تەواوی گۆڕێندراون و شێوێندراون و وەک گەرووی تورکیان لێ هاتووە.

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵە دەنگێک هەن کە ئەمڕۆ لە کوردیی سەروو (کرمانجی)دا، بە هۆی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی- تورکییەوە، کوژراون، یان شێوێندراون، بەو بیانووەی کە گوایە ئەو دەنگانە عەرەبین! وەکوو (ح، ع، غ، ق، ڵ، ڕ). کاتێک مرۆڤ، لە زاری کوردی باکوورەوە، گوێی لەو وشە کوردیانە دەبێت کە ئەو دەنگانەیان تێدایە (کە بە هەزارانن) پێکەنینی دێت، چونکە بە جۆرێک دەگوترێن وەک ئەوەی لە زاری کەسێکی بیانییەوە، کە تازە فێری کوردی بووبێت، بێنە دەر. ڕاستە هەندێک لەو دەنگانە لە بنەڕەتدا کوردی نەبوون، بەڵام بە هۆی تێکەڵیی کولتووریی کورد لەگەڵ عەرەب و فارسدا، هەروا لەڕێی خواستنی هەزاران وشەی ئەو دوو زمانە، کە ئەوجۆرە دەنگانەیان تێدایە، ئەو دەنگانە لەگەڵ زمانی کوردیدا گونجێندراون و بوونەتە کوردی. بەمەیش زمانی کوردی دەوڵەمەندتر بووە، نەک بە پێچەوانەوە. گەرووی مرۆڤی کورد، بە جۆرێکی سروشتی، لە ڕێگای هەزاران وشەوە، کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا چەسپاون و لە زمانی ڕۆژانەدا بەکار دەهێندرێن، لەگەڵ ئەو دەنگانەدا ڕاهاتوون. وێنەکانیان بە جۆرێکی سروشتی

بوونەتە بەشێک لە ئەلفوبێی کوردی. لەبەر ئەوە دەبینین کوردی باکوور، تەنانەت بە ئەلفوبێی لاتینییش، ناتوانن بە دروستی (خانی، مەلای جزیری، فەقێ تەیران) و نووسەرانی سەردەمی رۆشنگەریی باکووری کورستان (لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم سەرەتای سەدەی بیستەم) بخوێننەوە. ئەگەر بشتوانن بە زەحمەتێکی زۆرەوە، بیان خوێننەوە ئەوا تێیان ناگەن. چونکە بەرهەمی ئەو شاعیر و نووسەر و رووناکبیرانە پڕن لەو وشانەی ئەو دەنگانەیان تێدایە، کە لە نووسینی کوردیی باکووردا (بە چاولێکەری لە تورک) دەرهێندراون. هەروا لەو ئەدەبیاتە فراوان و هەمە لایەنە بێ ئاگان کە دووسەد ساڵە بە زمانی ئەدەبیی یەککگرتووی کوردی لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا هێنراوەتە بەرهەم. ئەوان تەنانەت نەکارن سوود لە ئەدەبیاتی ناوچەی بادینانیش وەربگرن، چونکە بە حەرفی لاتینی/تورکی نەنووسراوە.

کوردی باکووری کوردستان بە زمان و کولتوور و مێژووی خۆیان نامۆ کراون. سەپاندنی ئەلفوبێی لاتینی بەسەر گەلی باکووری کوردستاندا، بەکارترین ئامرازی ئەم بەخۆنامۆکردنە بووە. ئەلفوبێی لاتینی-تورکی دیوارێکی بەرزی لە بەردەم هەردوو گەلی باکوور و گەلی باشوور و رۆژهەلاتی کوردستاندا هەڵچنیوە. هەر هەوڵ و کۆششێک بۆ نزیکردنەوەی کولتووری و زمانی و هاوئاهەنگی (ئینتێگراسیۆن)ی نەتەوەیی، لە نێوان ئەو دوو بەشەی نەتەوەکەماندا، بە بێ یەکخستنی ئەلفوبێ، واتا خۆئازادکردنی کوردی باکوور، لە کۆیلایەتیی ئەلفوبێی تورکی و گەڕانەوەیان بۆ ئەلفوبێی کوردی، ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت.

ئەلفوبێی لاتینی-تورکیی، لە نێو کورددا، دەوڵەتی کەمالیستیی تورک سەپاندوویەتی. کەچی ئەلفوبێی کوردی، یەکەمین جار، مەلای جزیری و خانی و فەقێ تەیران لە نووسینی کوردیدا دایان هیناوە.

چوار سەدە زیاترە لە نووسینی کوردیدا بەکار دێت و بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لە زمان و کولتوور و هزری کورد. هەر مرۆڤێکی کورد، مەگەر وەک پێویست زانیاریی لە بارەی زمانی کوردییەوە نەبێت، یان کەمالیستێکی توندڕەو بێت، تا بتوانێت ئەلفوبێی کوردی بە ئەلفوبێی تورکی بگۆڕێتەوە و پشت لە میراتی ئەدەبی و کولتووریی چوارسەد ساڵەی نەتەوەکەی بکات.

دەکرێت لەم ڕووەوە ئاماژە بە ئەزموونی هەندێک گەلانی یەکێتیی سۆڤییەتی هەڵوەشاوە بدەین. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ دەسەڵاتی سۆڤییەت ئەلفوبێی (کیریلی)ی بە سەر هەندێک گەلانی سۆڤیەتدا، لەوانە گەلانی تورکزمان، سەپاند. لە ماوەی حەفتا ساڵی دەسەڵاتی سۆڤیەتدا، ئەو گەلانە بە دەیان هەزار کتێبییان لە بواری جۆراوجۆری زانین و زانست و ئەدەبدا، بەو ئەلفوبێیە، بڵاو کردەوە. کەچی دوای هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەت، ئەو گەلانە دەستبەرداری ئەلفوبێی (کیریلی) بوون.

دیارە کوردی باکووری کوردستان، ئازادن کام ئەلفوبی هەڵدەبژێرن. بەڵام ئەگەر ئەوان (وەک ئەو گەلانەی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە) دەستبەرداری ئەلفوبێی داگیرکەری وڵات و بکوژی زمانەکەیان ببن، چ زیانێک دەکەن؟ ئایا ئەوان جگە لە کۆیلایەتیی کولتووری چی لەدەست دەدەن؟

ئەلفوبێی لاتینی لە نووسینی کرمانجی (کوردیی سەروو)دا، لە دوای شکستی ئەزموونی گۆڤاری (هاوار)، تا سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم، لە نووسیندا بەکار نەهاتۆتەوە. کوردی سۆڤیەتی جاران، لە نووسیندا ئەلفوبێی کیریلییان بەکار دەهێنا. نزیکەی سیی ساڵێکە، هەندێک ڕووناکبیری باکووری کوردستان، لە سوێد و

هەندێک وڵاتی تری ئەورووپادا، بەو شێوەزمانە، یان بە هەندێک دیالێکتی ئەو شێوەزمانە و دیالێکتی زازا دەنووسن. تێکڕای ئەو بەرهەمە ئەدەبی و کولتوورییەی کە بە ئەلفوبێی لاتینی و بەو شێوەزمانە و زازا نووسراون، لە چەند سەد کتێبێک زیاتر نین، کە ئەوانیش زۆربەیان شیعر و چیرۆک و تێکستی فۆلکلۆرین. کەچی لە بەرامبەر ئەمەدا، لە باشووری کوردستاندا، مانگانە، چەند قاتی ئەو بەرهەمانە بە ئەلفوبێی کوردی و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، چاپ و بڵاو دەکرێنەوە. ئەم دیاردەیە نابێت وەک کەمایەسییەک بۆ کوردی باکوور دابندرێت، بەڵکو دەبێت وەک دەرئەنجامێکی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی دەوڵەتی تورک، بەرامبەر بە زمان و کولتووری کورد، تەماشا بکرێت.

زمانی کوردی لە باکووری کوردستاندا، کە شەڕی مان و نەمان دەکات، بە تەواوی لە بەردەم زمانی تورکیدا پاشەکشەی کردووە. زۆرینەی خەڵکی باکووری کوردستان ئەم زمانەیان بیر چۆتەوە و زمانی تورکی، بۆ ئەوان، بەتەواوی جێگای زمانی دایکی گرتۆتەوە. پرۆپاگەندەی دەوڵەتی تورک، زمانی کوردی لای خەڵکی کورد، وەک زمانی خەڵکی دواکەوتووی بێ کولتوور و گوندی و نەخوێندەوار و وەحشی، وێنا کردووە. زۆر لەو کوردانەی زمانی خۆیان دەزانن، بەڵام هۆشیاریی نەتەوەییان لاوازە، پێیان شەرمە قسەی پێ بکەن، چونکە پرۆپاگەندەی دەوڵەتی تورک ئەو زمانەی بە جۆرێک لەلا سووک و بێ بایەخ کردوون، کە ئەوان خۆیان ئارەزوومەندانە دەستبەرداری بوون. زۆرینەی کوردی ئەورووپانشینی باکوور، بە نووسەر و رووناکبیرانیشیانەوە، لە ماڵی خۆیاندا بە زمانی تورکی لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەدوێن. هەرچەندە منداڵەکانیان لە قوتابخانە، مافیان هەیە، هەفتەی چەند سەعاتێک، بە کوردی بخوێنن، کەچی دایک

و باوکیان دەیاننێرنە بەر خوێندنی تورکی، چونکە بڕوایان بەوە نەماوە کە زمانی کوردی بۆ داهاتووی منداڵەکانیان بایەخ و مانایەکی هەبێت.

ئەلفوبێ توخمێکی گرنگی کولتوورییە، وەک هەر توخمێکی تری کولتووری، تایبەتمەندیی کولتوورێک و نەتەوەیەک، لە بەرامبەری کولتوورێک و نەتەوەیەکی دیکەدا، پیشان دەدات. ئەلفوبێی کوردی لە باکووری کوردستاندا دەتوانێت قورساییەکی زیاتر بە زمانی کوردی بدات و وەک فاکتەرێکی تری کولتووری، لە خەباتی نەتەوەیی و بەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی بەتورککردندا، بەکار بهێندرێت. کوردی باکوور، لە ڕێی ئەلفوبێی کوردییەوە، ئەگەر تەنانەت بە تورکیش بنووسێت، دەتوانێت خۆی لە تورک جیا بکاتەوە.

هەر توخمیکی کولتووریی جیاواز دەتوانیت لە بەرامبەری داگیرکەری بیانیدا، ببێتە فاکتەری خۆجیاکردنەوە لە داگیرکەر. بۆچی ئەلفوبێی کوردی، وەک توخمێکی کولتووری و بەشیک لە زمانی کوردی، نەتوانێت کوردی باکوور لە تورک جیا بکاتەوە؟ ڕەتکردنەوەی ئەلفوبێی لاتینی- تورکی، کە بەشێکە لە ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم و ئامرازێکیشە بۆ کوشتنی زمانی کوردی، تەحەدایەکی گەورەی کەمالیزم و سیاسەتی کوشتنی زمان و کولتووری کوردییە، لە، تورکیادا. بەڵام ئایا کوردی باکووری کوردستان، دەتوانن دەستبەرداری ئەلفوبێی لاتینی-تورکی ببن و بۆ ئەلفوبێی خانی و مەلای جزیری و بەقیی تەیران، بگەڕێنەوە، یان ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم و دیماگۆگیای دەوڵەتی تورک ئەم ئەلفوبێیەیان لای ئەوانیش پیرۆز کردووە و ئەو وەهمەی لەلا دروستکردوون کە پێیان وایە، لە ڕێی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی-تورکییەوە بوونەتە گەلێکی ئەورووپایی؟!

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئینستیتوتی کوردی، پاریس ١٩٨٩، ل ٢٤

٢- فەرهاد شاکەلی، زمان و ئەلفوبێی ستانداردی کوردی، لە روانگەیەکی مێژوویی و زانستییەوە، رۆژنامەی ئاسۆ، ژ. ٤٣٨، رۆژی ٢٢-٥-٢٠٠٧

٣- دەوترێت کە گوایا هێژا جەلادەت بەدرخان، پێش ئەو کاتە (واتا پێش تورک) ویستوویەتی ئەلفوبیی لاتینی، لە نووسینی کوردیدا بەکار بهێنێت. بەلام ئەدەبیاتی نووسراو بە کوردیی باکوور لە دەرچوونی رۆژنامەی کوردستانەوە (١٨٩٨) تا شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤) کە هەموو گۆڤار و بلاوکراوەکانی کوردی، لە باکووری کوردستاندا، داخران بە ئەلفوبێی کوردی بوون. هێندەی من ئاگادار بم تاکە رووپەرێکی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی نەنووسرا بوو. ئەگەر هێژا جەلادەت رایەکی لەو جۆرەیشی هەبووبێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە لە ژێر کارتێکردنی ناسیۆنالیستانی تورکدا بووە، کە زۆر پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک بیریان لەم مەسەلەیە کردبۆوە و کاریان بۆ دەکرد. ئەو کاتە ناسیۆنالیستانی تورک، عەرەب و کورد پێکەوە، لە دژی دەسەلاتی ئیستیبدادیی سوڵتانەکانی عوسمانی، کار و خەباتییان دەکرد و داوای ریفۆرم و گۆڕانکارییان دەکرد.

٤- م. ئە. حەسرەتیان، یاسا دەستوورییەکانی تورکیا و کورد لە سەردەمی نوێدا، سەرچاوەی پێشوو، لا.٢٢

5 - Tove Skutnabb -Kangas, Minoritet, språk och rasism, s197

٦- هەمان سەرچاوە، لا. ١٩٨

# ئەنجام

زمانی کوردی بوون و پێناسەی نەتەوەیی کورد بەرجەستە دەکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا رۆوناکبیران و سیاسەتمەدارانی کورد، لە پێش هەموویانەوە، سەرکردایەتیی سیاسیی کورد، هێندە لە ئاست زمانەکەیاندا کەمتەرخەم و بێخەمن، کە لە هیچ وڵاتێکی دنیادا نموونەی نابیندرێت.

زمانی ئەدەبیی یەککگرتووی کوردی، لە مێژووی دووسەد ساڵەی پێشکەوتنیدا، بە جۆرێکی سروشتی بە ناوچەی جۆراوجۆری کوردستاندا بڵاو بۆتەوە، بە هەزاران وشەی دیالێکتە جیاوازەکانی کوردی تێکەڵاو بووە. سەدەیەکە لە زمانی شیعر و ئەدەبەوە گۆڕدراوە بە زمانی فیکر و رۆژنامەنووسی و زانست و زانین و سیاسەت و حکومەت و پەرلەمان. ئەمڕۆ ئاستی فیکر و شارستانەتی کورد و تایبەتمەندییە کولتووری و نەتەوەییەکانی کورد، لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا، بەر لە هەر شتێک، لە زمانە ئەدەبییەکەیدا دەردەکەون. ئەم زمانە ئەدەبییە یەککگرتووە، هەموو مەرج و نیشانەکانی زمانی ستانداردی لە خۆیدا بەرجەستە کردووە. دەیان ساڵیشە لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا رۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێت. بەڵام هێشتا زمانێکی بی خاوەنە، هیچ پلان و دەزگایەکی تایبەت نییە، کە چاودێری و سەرپەرشتی بکات. بە پێی پلانی زانستی و ستراتیجی، نۆرمی نووسین و رەوشی پێشکەوتنەکەی رێک بخات.

لەپاڵ ئەم زمانە ئەدەبییە یەککگرتووەدا، شێوەزمان و دیالێکتی تری زمانی کوردی (کرمانجی و زازا لە باکووری کوردستان و بادینانی) لە نووسیندا بەکار دەهێندرێن و بە جیا رەوشی خۆیان دەبڕن. لە هەمان کاتدا لە گەڵ ئەلفوبێی کوردیدا، ئەلفوبێی لاتینی-تورکی، لە دامەزراندنی دەوڵەتی کەمالیستی تورکیاوە، بەسەر گەلی باکووری کوردستاندا سەپێندراوە، ئەمەیش گرفتێکی گەورەتری بۆ کورد و زمانی کوردی دروست کردووە. چونکە گەلی باکووری کوردستان، بەهۆی ئەو ئەلفوبێیە و نامۆبوونی بە ئەلفوبێی کوردی، لە رابردووی مێژوویی و کولتووریی خۆی و لە تەواوی ژیانی رووناکبیریی بەشەکانی تری کورد دابڕاوە. بەمەیش جیاوازی و لێکدابڕانی زمانی و کولتووریی نێوان کوردی باکوور لەگەڵ کوردی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان، زیاتر بووە.

ئەمڕۆ، لە باشووری کوردستاندا، هەندێک لە دیالێکتەکان بەرامبەری زمانی ئەدەبیی کوردیی وەستاون و شەڕی زمانی حکومەت و پەرلەمان دەکەن و دەیانەوێت ستاتوسی ئەویان هەبێت؟

ئاشکرایە ئەم گرفتانە بەرهەمی ئەو دۆخە سەختەن کە نەتەوەی کورد، بە هۆی دابەشکردن و داگیرکردنی وڵاتەکەیەوە، تووشیان هاتووە. بەڵام ئایا کورد تاکەی دەتوانێت بە دەست برینەکانی رابردووەوە بناڵێنێت؟ تاکەی گرفتەکانی خۆی، لە پێش هەموویانەوە گرفتی بەستانداردکردنی زمانی کوردی و چەسپاندنی رێسا و نۆرمی زمانی نووسین، بەبێ چارەسەر دەهێڵێتەوە؟

بە رای من کاتی ئەوەیە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان سیاسەتێکی زمانی، وەک بەشێکی گرنگی سیاسەتیی کولتووری، دابڕێژێت. زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لە باشووری کوردستاندا، بە زمانی ستاندارد بناسێت و دەزگای تایبەتی بۆ دابمەزرێنێت. ئەو دەزگایە دەتوانێت باس و لێدوانی جیدی و بەرپرسانە، لە بارەی گرفتەکانی زمانی کوردییەوە، دەست پێ بکات. بە هاوکاریی پسپۆرانی زمان و زانکۆکانی کوردستان، پلانی درێژخایەن بۆ زمانی کوردی و نزیککردنەوەی شێوەکانی زمانی کوردی و پاراستنی دیالێکتەکانی، دابڕێژێت. هەروا سوود لە ئەزموونی سیاسەتی زمانیی نەتەوەکانی تر وەربگیرێت.

کورد، لە هەر بەشێکی کوردستاندا، بە هەر دیالێکتێک و شێوەزمانێک بدوێن و بنووسن، خۆیان بە کورد و زمانەکەیان بە کوردی دادەنێن. خەڵکی تریش هەر بە کوردیان دەزانن. ئەم مەسەلەیە، لە رووی سیاسی و نەتەوەییەوە بایەخی زۆری هەیە. بەڵام ئایا ئەم فاکتەرە بە تەنیا دەتوانێت پێش لە درووستبوونی دوو، یان سێ زمانی کوردی بگرێت؟

راستییەکەی بەکارهێنانی دوو شێوەزمان و دوو ئەلفوبێی جیاواز لە نووسیندا، زمانی کوردی بەرەو دوو زمانی جیاواز دەبات. ئەمەیش بە نۆرەی خۆی تەنیا رێگای هاوئاهەنگیی نەتەوەیی و کولتووری ناگرێت، بەڵکو دەتوانێت کورد بکاتە دوو گەلی خاوەن دوو زمان و دوو کولتووری جیاواز و تەنانەت لێکدابڕاو. سەرەتای ئەم دابەشبوونە لە نێوان زمان و گەلی باکووری کوردستان و زمان و گەلی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا دەستی پێ کردووە. ساڵانێکە کوردی باکوور، وەک گەلێکی جیاوازی خاوەن تایبەتمەندیی زمانی و کولتووری، بە جیا و دابڕاو لە بەشەکانی تری کورد و لە ژێر شاڵاو و کارتێکردنی زمان و کولتووری تورکیدا، درێژە بە ژیانی سیاسی و کولتووریی خۆیان دەدەن. بە پێی ئاگاداریی

نووسەری ئەم باسە، هێندەی کوردی باکوور لە زمانی تورکی و کولتوور و شێوەژیانی تورکەوە نزیکن، دەیەکی ئەوە لە کولتوور و زمان و شێوەژیانی کوردی باشوور و رۆژهەلاتی کوردستانەوە نزیک نین. لەهەمان کاتدا، کوردی باشووری کوردستان لە زمان و کولتووری عەرەبی و کوردی رۆژهەلاتی کوردستان، لە زمان و کولتووری فارسییەوە نزیکترن تا لە کولتووری کوردی باکووری کوردستان، ئەمە راستییەکی سەختە، بێدەنگبوون لەم راستییە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت.

دیاردەی فرەدیالێکتی، لە ولاتانی پێشکەوتوودا، بە سەرچاوەیەکی دەولەمەندیی کولتووری دادەندرێت. دیالێکتەکان سنوور و پایە و ستاتووسی خۆیان بۆ دیاری کراوە و ناتوانن، شەڕی زمانی ستاندارد بکەن. ئایا ئەم دیاردەیە، لە باشووری کوردستاندا، کولتوور و زمانی کوردی بە پێزتر دەکات، یان جیاوازیی کولتووری و زمانی و تەنانەت نەتەوەیی کورد، لەم هەرێمەدا، زیاتر دەکات؟

سیاسەتی داهاتووی کولتووری ، بە تایبەتی سیاسەتی زمانیی دەسەلاتی سیاسی، لە هەرێمی کوردستاندا، دەتوانێت، لە داهاتوودا، وەلامی ئەو پرسیارە بداتەوە.

## ئەلفوبێی کوردی
## بەشێکە لە پێناسەی کولتووریی کورد

*** ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بچینە ناو باسەکەوە و بپرسین: بە رای ئێوە ئەلفوبێی کوردی، بایی ئەوە گرفت و ئاریشەی هەیە کە بیر لە گۆڕینی بکەینەوە؟**

-- بە رای من ئەلفوبێی کوردی ئەوەندە گرفتی نییە کە بیر لە گۆڕینی بکەینەوە. خۆ ئەگەر گرفتیشی هەبێت، پێش ئەوەی بیر لە گۆڕینی بکەینەوە، دەبێت باس لەو گرفتانە بکەین و هەوڵی چارەسەریان بدەین. بۆیە ئەم بانگەشەیە، لە بنەڕەتدا، بە ئامانجێکی سیاسییە و پەیوەندیی بە گرفتی ئەلفوبێی کوردییەوە نییە. ئەلفوبێی کوردی (ئەلفوبێی عەرەبی، فارسی هەموارکراو) چوار سەدە زیاترە لە نووسینی کوردیدا (بە دیالێکتی کوردیی باکوور، گۆران و کوردیی باشوور) چەسپاوە. تەواوی میراتی ئەدەبی و کولتووریی نووسراوی ئێمە بەو ئەلفوبێیە نووسرواوە، لەگەڵ گەسەشەکردنی زمان و ئەدەبی کوردییدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بە تەواوی لەگەڵ زمانی کوردییدا گونجێندراوە. بۆیە ئەم ئەلفوبێیە، لەمڕۆدا، باشترین و شیاوترین جۆری ئەلفوبێیە کە لەگەڵ زمانەکەماندا بگونجێت.

لە نێو ئەو گەلانەی کە ئەو جۆرە ئەلفوبێیە بەکار دەهێنن، بۆ نمونە عەرەب و فارس و دەری..تاد، کورد توانیویەتی، لە رێنووسەکەیدا، باشتر ئەم ئەلفوبێیە لە گەڵ سروشت و تایبەتمەندیی زمانەکەیدا بگونجێنێت. دەنگە تایبەتەکانی زمانی کوردی (پ، چ، ڕ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ، ێ) تیپی سەربەخۆیان بۆ داندراون. کە چی هەندێک لەم دەنگانە، کە لە هەندێک وشە و ناوی بیانیدا دووبارە دەبنەوە، هێشتا لە نووسینی عەرەبی و فارسی و دەریدا جێگایان نەکراوەتەوە. ئەو گۆڕانکارییە گرنگەی کە لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی رابردوودا، لە رێنووسی کوردیدا کرا، گرفتێکی ئەوتۆی لە ئەلفوبێی کوردیدا نەهێشت، چونکو لە رێی داهێنانی وێنەی تایبەتی دەنگە بزوێنەکانەوە، وشەی کوردی چۆن دەگوترێت ئاوەهایش دەنووسرێت. کەچی هێشتا ئەو زمانانەی تر کە بە هەمان ئەلفبێ دەنووسرێن لە خوێندنەوەدا گرفتی جیدی بۆ خوێنەر، بە تایبەتی بۆ خوێندکار و کەسانی بیانی کە ئەو زمانانە فێردەبن، دروست دەکەن. چونکو لە نووسینی ئەو زمانانەدا زۆربەی تیپە بزوێنەکان نانووسرێن• ئەمەیش جیاوازییەکی هێندە گەورەی لە نێوان شێوەی نووسینی پەیڤ و گوتنیدا دروست کردووە کە لە زۆر حاڵەتدا ئەگەر مرۆڤ مانای وشەکە نەزانێت، زەحمەتە بە دروستی وشەکە، وەک خۆی، بخوێنێتەوە. کەچی لە نووسینی کوردیدا ئەم جۆرە گرفتانە نین، ئەمەیش نیشانەیەکی تری ئەو هارمۆنی و گونجانەیە کە لە نێوان زمانی کوردی و ئەلفوبێیەکەیدا هەیە. لەبەر ئەوە بانگەشەی گۆڕینی ئەلفوبێی کوردی بۆ ئەلفوبێی لاتینی پەیوەندی بە زانستی زمان و گرفتی ئەلفوبێی کوردی و پێداویستیی زمانی کوردییەوە نییە، بەڵکو ئەم بانگەشەیە، کە هەندێک رووناکبیری کوردی باکووری کوردستان داوای دەکەن، لە ناوەرۆکدا، مەسەلەیەکی سیاسییە و بەشێکە لە ئەنجامەکانی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم.

*** دروستبوون و هێنانه ئارای ئەم بابەت و بیرۆکەیە- ئەلفوبێی لاتینی- ئەوەندەی من زانیاریم هەبێت لە سەرەتاوە لەسەر دەستی خەڵکی غەیرەکورد سەری هەڵدا و دواتر بەدرخانییەکانیش کاریان لەسەر کردووە، بەم پێیە خوێندنەوەی تۆ بۆ ئەم حاڵە چییە، لە کاتێکدا کارێکی ئاوا گرنگ و چارەنووسساز بە نیسبەت نەتەوەوە دەبێت لە واقیعی خۆیانەوە سەر هەڵبدات؟**

-- ئەلفوبێی لاتینی لە نووسینی کوردیدا، یەکێک لە بەرهەمە هەرە دزێوەکانی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم و دەوڵەتی کەمالیستی تورکە. ئاشکرایە دەوڵەتی کەمالیستی تورکیا، بە هۆی خۆبەکەمگری لە بەرامبەری ئەوروپا و ئیدیعای ئەوروپاییبوونی تورک و بە مەبەستی دابڕینی گەلانی نێو تورکیا لە رابردووی کولتووریی خۆیان و کوشتنی زمانەکانیان و تواندنەوەیان لە ناو رەگەزی تورکدا، ئەم ئەلفوبێیەی لە تورکیادا سەپاند. لەگەڵ ئەو ئەلفوبێیەدا تەنانەت زمانی تورکیی عوسمانی، کە پڕی بوو لە وشەی عەرەبی و فارسی و کوردی کۆتایی پێ هێنرا، لە بری ئەو لەهجەی تورکیی ئەستەمبوولی کرایە زمانی ستانداردی تورکی و بە زۆر بەسەر گەلانی تورکیادا سەپێندرا. بەو جۆرە دەوڵەتی کەمالیستی تورکیا هەموو نەتەوەکانی نێو تورکیای (بە تورکییشەوە) لە ریشەی کولتووری و ئەدەبی و رابردووی مێژوویی خۆیان دابڕی و بەو کولتوور و رابردووە مێژووییەی نامۆ کردن. ئەمەیش بەشێک بوو لە ئامانجەکانی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم کە دەیویست، لە نێو سنووری تورکیادا، نەتەوەیەکی نوێی تورک، لە گەلانی تورک، کورد، عەرەب، لاز، چەرکەس و گورجی..تاد، دروست بکات. دوای سەپاندنی ئەو ئەلفوبێیە و زمانی تورکی وەک تاکە زمانی رەسمیی دەوڵەت، پرۆسێسی بە تورکردنی ئەو گەلانە و کوشتنی زمان و

کولتوورەکەیان دەستی پێکرد. پرۆسێسەکەیش پشتی بە دوو ئامراز بەست. یەکەمیان هێزی دەستوور و قانوون، دووەمیان زەبروزەنگ و تیرۆری دەوڵەت. لە نیسانی ساڵی ١٩٢٥دا ئەنجومەنی بەرزی نیشتمانیی تورک، یەکەمین دەستووری تورکیای پەسند کرد. بە پێی مادەی دووەمی دەستوورەکە زمانی تورکی بە تاکە زمانی رەسمی و دانپێدانراوی تورکیا داندرا. هەروا لە مادەی هەشتا و هەشتەمیدا هاتووە: (هەموو دانیشتوانی تورکیا، بە بێ جیاوازیی ئاینی و نەژادی تورکن). ئەم مادە دەستوورییانە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی تواندنەوەی گەلانی غەیرە تورک (لەوانە کورد) و کوشتنی زمان و کولتوورەکەیان پەسەند کران. بەڵام کاتێک کورد، لە ساڵی ١٩٢٥ دا لە رووی سیاسەتی کوشتنی زمانەکەی و تواندنەوەی نەتەوەییدا رابوو، دەوڵەتی رەگەزپەرستی تورک، لە ریی کوشتاری بە کۆمەڵی کوردەوە، کوشتنی زمان و کولتووری کوردی (کولتوور ساید)ی گۆڕی بە جینۆسایدی کورد.

دوای ئەم تاوانە لە تورکیادا نۆرەی داتاشینی مێژوویەکی نوێی خورافی و ساختە بۆ تورک هات، کە بە تێزی هەتاو ناسرا. بە پێی ئەم تێزە کولتوور و شارستانی و تەنانەت ریشەی زمانانی دنیا، لە بنەڕەتدا تورکی بوون و هەموو دنیا قەرزارباری کولتوور و زمانی تورکن! لەم دۆخە نوێ و دژوارەدا بوو کە، لە ناوەڕاستی ساڵانی سییەکانی سەدەی رابردوودا، بەدرخانییەکان لە کار و چالاکیی سیاسی و رووناکبیرییاندا ئەلفبێی لاتینییان بەکار هێنا. بەڵام ئایا ئەوان ئەم ئەلفوبێ لاتینییە بە تورککراوەیان لەبەر ئەوە بەکار هێنا چونکو لەگەڵ تایبەتمەندیی زمانی کوردیدا دەگونجێت؟ ئاشکرایە ئەوان تەنیا رووناکبیری گرنگی سەردەمی خۆیان نەبوون، بەڵکو ئایدیۆلۆجیستانی بزاڤی ناسیۆنالیستیی کورد و لە رابەرانی بزاڤەکە بوون. ئەوان، کە لە سوریا خەباتی رووناکبیری و سیاسیی خۆیان لە

دژی دەوڵەتی توکیا درێژە پێ دەدا، رەنگە ناچار بووبن کە بڵاوکراوەکانیان بە ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بنووسن، چونکو لەو ماوەیەدا نەوەیەکی نوێی خوێندەواران لە باکووری کوردستاندا دەرکەوتبوون، کە تەنیا بەو ئەلفوبێیە دەیان توانی بخوێننەوە. خوێندەوارانی نەوەی پێشوویش، کە ئەلفوبێی کوردییان دەزانی و لە کوشتاری دەوڵەتی تورک دەرباز بوو بوون، فێری ئەو ئەلفوبێیە نوێیە بوو بوون. بە رای من لەبەر ئەم هۆکارە پراگماتییانە بوو، نەک هۆکاری زمانی، کە هێژا کامەران بەدرخان و هاورێکانی لە مەنفادا کەوتنە بەکارهێنانی ئەم ئەلفوبێیە نوێیە. چونکو ئەوان و هەڤاڵانیان، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، واتا پێش دامەزراندنی دەوڵەتی کەمالیستی تورکیا، هەموو نووسین و بڵاوکراوە و گۆڤارە سیاسی و رووناکبیرییەکانیان (لەوانە رۆژنامەی کوردستان، گۆڤاری هێڤی کورد..تاد) بە هەمان ئەو ئەلفوبێیە کوردییە بوو کە پێشتر مەلای جزیری، خانی، فەقی تەیران، مەولەوی، نالی، حاجی قادری کۆیی و عەبدولرەزاق بەدرخان..تاد پێیان دەنووسی و دەخوێندەوە. ئەو ئەلفوبێیە لەو رۆژەوە کە زمانی کوردی، پێش زیاتر لە چوار سەدەیەک، لە زمانی پەیڤینەوە گۆردراوە بە زمانی نووسین، بەشێکی گرنگ بووە لە زمان و پێناسە (ئایدێنتیتی)ی کولتووری و نەتەوەییمان و لە ناوجەرگەی واقیعی کولتووری و رووناکبیریی کۆمەڵەکەمانەوە سەری هەڵداوە و لەگەڵ تایبەتمەندیی زمانەکەمان و رەوشی گەشەکردنیدا گونجێندراوە. هەروا ئەو ئەلفوبێیە، نیشانەی پەیوەندیی زیندووی کولتووری و رووناکبیریی نێوان کورد و ئەو گەلانەیە. بە کورتی من، وەک شاعیرێک، کە هەمیشە و لە سەختترین رۆژانی مەنفادا زمانەکەم وڵاتم بووە، ناتوانم زمانی کوردی بەبێ ئەلفوبێ کوردییەکەی وێنا بکەم، چونکو ئەلفوبێی کوردی روخسار و پێناسەی درەوشاوەی زمانەکەمانە.

*** به رای تۆ سەرهەڵدانی بیرۆکەی ئەلفوبێی لاتینی لای کورد پرۆژەیەک بوو لە پێناو زمانی کوردیدا یان بە نیازی دیکە بوو؟**

-- پێشتر وەڵامی بەشێکی ئەم پرسیارەم دایتەوە. سەرهەڵدانی بیرۆکەی ئەلفوبێی لاتینی و بەکارهێنانی لە لایەن رووناکبیرانی باکووری کوردستانەوە کەم تا زۆر، دوور تا نزیک لە پیناو زمانی کوردیدا نەبوو، بەڵکو هەوڵدانێکی رووناکبیران و ناسیۆنالیزمی کورد بوو بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو دۆخە نوێیە سەختەدا کە ناسیۆنالیزمی تورک لە تەواوی سنووری دەوڵەتی تورکیادا (بە باکووری کوردستانیشەوە) سەپاندنی. بۆ ئەوەی ناسیۆنالیزمی کورد لە مەنفا (ئێکسیل)دا بتوانێت لە رەگەکەی (گەلی باکووری کوردستان) دانەبڕێت، درێژە بە بوون و بەردەوامبوونی خۆی بدات و پارێزگاریی زمانی کوردی بکات و هۆشیاریی سیاسی و نەتەوەیی لە باکووری کوردستاندا بڵاو بکاتەوە، ناچار بوو ئەو ئەلفبێیە نوێیە زاڵە لە نووسیندا بەکار بهێنێت. لەو سەردەمە و دواتریشدا، کە ئەلفوبێی کوردی لە بیر گەلی باکووری کوردستان برابۆوە، ئەلفوبێی لاتینی-تورکی بوو بە کۆد یان پردێکی زمانیی نێوان رووناکبیرانی مەنفاو گەلەکەیان لە باکووری کوردستاندا. لە رووی زانستی زمانەوە هیچ بەڵگەیەک نییە بیسەلمێنێت کە پرۆژەی ئەلفوبێی لاتینی-تورکی پرۆژەیەک بوو بیت لە پێناو زمانی کوردیدا، بە هاندانی بیانی بووبێت. بەلای زۆرەوە ئەمە کارێکی پراگماتییانەی ناسیۆنالیزمی کورد بوو، کە نیازێکی سیاسی-نەتەوەیی لە پشتەوە بوو.

*** با بگەڕێینەوە سەر ئێستا، راستە کە ئەلفوبێی لاتینی پێویستییەکی ئەمڕۆی زمانی کوردییە؟ چی بە خاوەنانی ئەم رایە دەڵێی؟**

– ئەلفوبێی لاتینی رەنگە تا ئێستا بۆ کوردی باکووری کوردستان پێویست بێت، چونکو ئەوان، بە رووناکبیر و نووسەرانیشیانەوە تەنیا بەم ئەلفوبێیە دەتوانن بخوێننەوە و بنووسن. ئەوان کە زمان و کولتوورەکەیان بەر هەڕەشەی کوشتن کەوتوون، ئێستا تەنیا بەهۆی ئەم ئەلفوبێیە دەتوانن درێژە بە پەوەندیی رووناکبیرانەی خۆیان بە زمانەکەیانەوە بدەن و هەست و بیر و خەونی خۆیان بە زمانەکەیان دەر ببڕن. بۆیە ئەوان مافی خۆیانە ئەو جۆرە ئەلفوبێیە بەکار بهێنن. بەڵام ئەو ئەلفوبێیە لاتینییە–تورکییە، لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا پێویستییەکی زمانی کوردی نییە و تەنیا بۆ ئەوە بە سوودە کە مرۆڤ بتوانێت، بە هۆیەوە، بەرهەمی نووسەرانی باکووری کوردستان بخوێنێتەوە.

*** ئەمرۆ کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان تیپی لاتینی، لە نووسینی تێکستەکاندا، بەکار دەهێنن. بۆ ئەمەیش پاساوی ئەوە دەهێننەوە کە تاکو کوردانی هەندەران لێیان حاڵی بن و..هتد، هەروەها دەرکردنی گۆڤار و چاپکردنی کتێب بەم ئەلفوبێیە، لە کاتێکدا ئەلفوبێی رەسمی بەکارهێنراو لە لە کوردستاندا ئەلفوبێی عەرەبی دەستکاریکراو بۆ کوردییە، ئەم حاڵەتە چۆن دەخوێنیتەوە؟**

–- راستە بەکارهێنانی تیپی لاتینی لە نووسینی تێکستەکاندا بەو مەبەستەیە کە کوردی باکووری کوردستان لەم رێگەیەوە سوود لەم کەناڵە تەلەڤزیۆنییانە وەربگرن و هۆگریان بن. من لەمڕۆدا ئەم کارە بە ئاسایی و تەنانەت بە باشیش دەزانم. خوێندەوارانی کوردی باکوور، تەنیا ئەم ئەلفوبێ لاتینییە–تورکییە دەزانن. ئەوان مافی خۆیانە کە لە رێی ئەو کەناڵە تەلەڤزیۆنییە کوردییانەوە هەواڵەکانی کوردستان و جیهان بخوێننەوە. لەم رێگەیەشەوە دەشێت بە شێوەزمانی کوردیی باشوور رابێن و پێی ئاشنا ببن. دەرکردنی گۆڤار و چاپکردنی کتێب بەم ئەلفوبێیەش کارێکی ئاسایی و تەنانەت

باشیشە، چونکو لە بنەڕەتدا بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردیی باشووری کوردستانە، بە کوردی باکووری کوردستان. ئایا ناکرێت ئەمە بکرێتە پردێکی ئەدەبی-زمانی لە نێوان کوردی باکوور و باشووردا؟ ئاشکرایە دۆخی مێژوویی داگیرکردن و لێکدابڕان و دابەشکردنی کوردستان، تەنیا دابڕان و دابەشکردنێکی جیۆگرافی و سیاسی نییە، بەڵکو کولتووری و زمانییشە. بۆیە هەر هەنگاویک بۆ لێکنزیکبوونەوەی زمانی و کولتووری، دەشێت سەرەتایەک بۆ بەهێزبوونی هەستی هاوچارەنووسی و هۆشیاریی نەتەوەیی و هەماهەنگی (ئینتیگراسیۆن)ی نەتەوەیی پێک بێنێت و جیاوازیی نێوان ئەو دوو شێوە زمانە کەمتر بکاتەوە. بە رای من تا ئەو کاتەی بەشێک لە نەتەوەکەمان ناچار کراوە تیپی لاتینی بەکار بهێنێت، دەکرێت لە قوتابخانەکانی باشووری کوردستاندا، لە قۆناخی، بۆ نموونە دواناوەندیدا، شێوەزمانی کوردیی باکوور بەو ئەلفوبێیە لاتینییە- تورکییەبخوێندرێت، تا خوێندکاران بە ئەدەبی کوردی لە باکووری کوردستان ئاشنا ببن.

*** خەڵکێک پێی وایە ئەلفوبێی لاتینی، کورد بە رووی جیهاندا دەکاتەوە چونکە ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆری زمانە زیندووەکانی دنیا بەم ئەلفوبێیە دەنووسرێن، هەروەها بۆتە نوێنەری زمانی تەکنۆلۆجیا و دیجیتال. دەوترێ بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی زووتر بێگانە فێری زمانەکەمان دەبن. لە بەرامبەری ئەم رایانەدا چیتان هەیە.**

-- ئەمە پرسیارێکی گرنگ و فرە لایەنیشە، بۆیە رێگەم بدە کەمێک زیاتر لە بارەیەوە بدوێم:

١ ـ بە رای من هیچ پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان کرانەوەی نەتەوە و کولتوورێک بە رووی جیهاندا و نێوان ئەلفوبێی لاتینیدا نییە. کرانەوەی نەتەوەیەک بە رووی جیهاندا مەسەلەیەکی سیاسی،

ئابووری و کولتوورییە و بە چەندان فاکتەری ترەوە بەستراوەتەوە، لەوانە زمان و ئەو بەها کولتووری و زانستی و ئەو زانیینەی زمانەکە لەگەڵ خۆیدا هەڵی گرتووە. ئەگەر ئەلفوبێ کلیلی کرانەوە، یان قوفڵی داخرانی نەتەوەیەک بووایە بە رووی جیهاندا، دەبوو ئەمڕۆ چین و یابان و باشووری کۆریا (کە ئەلفوبێیان نییە و لە جیاتیان هەیرۆگلیف بەکار دێنن، کە لە چینیدا نزیکەی ٢٧٠٠ هەیرۆگلیفە) داخراوترین و گۆشەگیرترین گەلانی دنیا بوونایە، چونکو بە هۆی ئەم هەیرۆگلیفەوە، بیانییان بە زەحمەت فێری زمانەکەیان دەبن، بۆیە دەبوو ئەوان و دەیان نەتەوەی دی دەمێک بووایە بیریان لە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بکردایەتەوە. بەڵام کام وڵاتی دنیا هەیە کە بە رووی کاڵای یابانی و چینیدا نەکرابێتەوە و کۆمپانیا و ریستورانگی چینییان تێدا نەبێت؟ کام وڵاتی گرنگی سەرمایەداری هەیە کە، لە چینیدا، بە ملیاران دۆلار بۆ کاری وەبەرهێنان بەکار نەهێنێت؟ ئەمڕۆ بە دەیان وڵات لە دنیادا هەن کە ئەلفوبێی لاتینی بەکار ناهێنن و بە هیچ جۆرێک بیریان لەوە نەکردۆتەوە و مەحاڵیشە بیر لەوە بکەنەوە کە ئەلفبێی نەتەوەیی خۆیان بۆ لاتینی بگۆڕن، کەچی بە رووی دنیادا کراوەن و بە دەیان رایەڵی ئابووری، سیاسی، گەشتیاری و کولتوورییەوە بە دنیاوە بەستراونەتەوە. مرۆڤ دەبێت یان نەزان و نەفام بێت، یان کەمترین رێز و حورمەتی بۆ خۆی و بۆ کولتوور و میراتی ئەدەبیی نەتەوەکەی نەبێت، یاخود لە بەردەم ئەوروپادا، خۆی پێ بچووک بێت، تا بتوانێت بیر لە گۆڕینی ئەلفوبێی زمانەکەی بکاتەوە. ئەزموونی ناسیۆنالیزمی تورک و دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک، لە بارەی گۆڕینی ئەلفوبێ، وەک زۆر ئەزموونی تری تورک سەقەت و تایبەتە و بە مەبەستێکی رەگەزپەرستانە بووە. بۆیە ناکرێت و رەنگە نەتواندرێت دووبارە بێتەوە، تاوانیشە کۆپی بکرێتەوە. دەوڵەتی نەتەوەیی تورک، بە رابەرایەتیی مستەفا کەمال،

لەبەر ئەوە ئەلفوبێی تورکیی عوسمانی بە ئەلفوبێی لاتینی نەگۆڕی چونکو ئەم ئەلفوبێیە نوێیە لەگەڵ زمانی نوێی تورکی و گلۆبالیزمدا دەگونجێت و نوێنەری زمانی تەکنۆلۆجیا و دیجیتاڵە. بەڵکو لە بنەڕەتدا لە بەر کۆمەڵێک هۆکاری سیاسی و سایکۆلۆجی (گرێی دەروونیی خۆبەکەمزانینی تورک لە بەرامبەری ئەوروپادا) ئەو کارەی کرد.

کاتێک ئیمپراتۆریای عوسمانی، لە جەنگی یەکەمی جیهاندا، تێک شکێندرا، ناسیۆنالیزمی تورک ڕێباز و سیاسەتی پانتۆرانیزمی گرتە بەر، بەو ئامانجەی کە لە جێی ئیمپراتۆریای فرەنەتەوەیی عوسمانی، دەوڵەت (ئیمپراتوریا)یەکی نەتەوەیی تورکی لە گەلانی نێو دەوڵەتی روخێندراوی عوسمانی و گەلانی تورکزمانی دەرەوەی تورکیا، پێک بهێنێت. واتا تورک ئایدیۆلۆجیای ئاینیی ئیسلامی، کە ئایدیۆلۆجیای دەوڵەتی عوسمانی بوو، گۆڕی بە ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیستی تورک و پانتۆرانیزم. بەم جۆرە تورکبوون، لە جیاتی موسوڵمانبوون، کرا بە بنەمای ماف و هاووڵاتیبوون لە دەوڵەتی نوێی تورکیادا. پرۆسێسی گۆڕینی ئەلفوبێ، شانبەشانی پرۆسێسی کوشتنی زمانی گەلانی غەیرەتورک و چەسپاندنی لەهجەی ئەستەمبوول، وەک زمانی ستانداردی تورکی، هەنگاوی نا و بە زەبری ستەم و تیرۆری دەوڵەت سەپێندرا. دەوڵەتی تورک، زمانی هەموو گەلانی تورکیای یاساخ کرد. لە بەرامبەردا زمانی تورکی بە تاکە زمان و نەتەوەی تورکی بە تاکە نەتەوەی دانپێدانراوی تورکیا دانا، بەکارهێنانی زمانی دیکەی گەلانی نێو تورکیا بە تاوانێک، کە سزای توندی بە دواوە بوو، لەقەڵەم دا. بۆ سەرکەوتنی ئەم سیاسەتە زمانییە- نەتەوەییە دەبوو، لە پاڵ تۆقاندن و کوشتنی بە کۆمەڵدا، گەلانی تورکیا، لە ریشەی کولتووریی خۆیان داببڕدرێن و نەتەوەیەکی نوێی تورکی، بەو جۆرەی ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم دەی خواست، دروست بکرێت. گۆڕینی ئەلفوبێی عوسمانی

(عەرەبی، فارسی تورکی و کوردی) بە ئەلفوبێی لاتینی و بەتورککردنی ئەم ئەلفوبێیە نوێیە، بەشێکی گرنگی ئەم سیاسەتە زمانییە- نەتەوەییە رەگەزپەرستییە و ئامرازێکی سەرکەوتنیشی بوو.

دەوڵەتی ناسیۆنالی تورک کەوتە بەتورککردنی خەڵکانێک کە بە تەواوی لە رابردووی کولتووری و رووناکبیری و تەنانەت لە زمانی خۆیان دابڕابوون. لەهجەی تورکیی ئەستامبووڵ، بە ئەلفوبێی لاتینی، لەجیاتی زمانی تورکیی عوسمانی، کرایە زمانی رەسمیی دەوڵەت و تاکە زمانی دانپێدانراو و رێگەپێدراو.

٢ - فێربوونی زمانێکی بیانی بەپەیوەندی راستەوخۆی بە جۆری ئەلفوبێوە نییە. نەمبیستووە و نەمزانیوە کە ئەلفوبێ پرۆسێسی فێربوونی زمان خێراتر، یان خاوتر بکات. ئەگەر وابووایە دەبوو ئەمرۆ زمانی تورکی لە جیهاندا، لە زمانانی رووسی (کە بە ئەلفبێی کیریلی دەنووسرێت) یان عەرەبی و فارسی بڵاوتر و ناوداتر بووایە، کە دیارە وانییە. یان دەبوو تورکەکان لە خەڵکی ئەو نەتەوانە ئاسانتر فێری زمانانی ئەوروپایی بوونایە. کەچی ئەزموونی تورکەکانی ئەوروپا، بە تایبەتی ئەڵمانیا، دەری دەخەن کە زۆرینەی تورک بیست ساڵ لە وڵاتێکی ئەوروپاییدا دەژین، کەچی فێری زمانی ئەڵمانی نابن. هەر بیانییەک، کە بیەوێت یان بڕیار بدات فێری یەکێک لەو زمانانە ببێت، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا، یان ئەوپەری چوار رۆژێکدا ئەلفوبێیەکەی فێر دەبێت. چەند رۆژێک لە پرۆسێسی فێربوونی زمانێکی نوێدا، هێندە کەمە کە شایەنی باسکردن نییە.

٣ - ئێمە ناتوانین بڵێین کە ئەلفوبێی لاتینی نوێنەری زمانی تەکنۆلۆجیا و دیجیتالە، رەنگە زمانی ئینگلیزی ئەو نوێنەرایەتییە بکات، چونکو ئەلفوبێ بە تەنیا ناتوانێت ببێتە نوێنەی زمان. ئەوەندە هەیە کە تیپی لاتینی (ئەویش لاتینی-ئینگلیزی، نەک لاتینی- تورکی) بۆ دۆزینەوەی ئادرێس لە ئینتەرنێتدا و نووسینی ئادرێسی ئیمەل

کراوەتە ستانداردێکی جیهانی و تەنیا لەم بارەیەوە، نەک لە بارەی خوێندنەوە و وەرگرتنی زانیاری و تێگەیشتنی زانستەوە، یارمەتیمان دەدات.

*** گوایا دیالێکتی کرمانجی ژوورو، لە رێگای ئەلفوبێی لاتینییەوە باشتر و دروستتر دەنگەکانی دەنووسرێتەوە، ئایا بە بۆچوونی ئێوە ئەمە رایەکی دروست و بابەتییە؟**

-- بەداخەوە ناچارم بڵێم کە ئەم بۆچوونەیش هەڵەیە. ئەوانەی ئەم قسەیە دەکەن، با هەندێکیان لە دڵسۆزیشەوە بێت، باسی شتێک دەکەن کە ئاگادار نین و زانیارییان لە بارەیەوە نییە، چونکو بە باشی تایبەتمەندیی زمانی کوردی (کوردیی سەروو، یان کوردیی خواروو) و سروشتی دەنگەکانی نازانن. ئەوانەی بە ئاگاییەکی هەڵەوە پێ لەسەر ئەم بۆچوونە چەوتە دادەگرن هەندێک رووناکبیری باکووری کوردستانن، کە لە نێو هەموویاندا، رەنگە دە کەسیان ئەوەندە کوردی باشوور و ئەلفوبێی کوردی نەزانن کە بتوانن تەنانەت نامەیەک، یان چەند دێڕێک بە کوردیی باشوور بخوێننەوە. بۆیە بە تەواوی لەو سامانە ئەدەبییەی، لە ماوەی دووسەد ساڵدا، بە شێوەزمانی کوردیی خواروو نووسراوە، بێ ئاگان. ئەوان بە راستی کەموزۆر ئاگاداری شێوەزمانی کوردی بەگشتی کوردیی خواروو بەتایبەتی نین و تایبەتمەندییەکانی ئەم زمانە و سروشتی دەنگەکانی نازان. لە زمانی کوردیدا کۆمەڵە دەنگێک هەن کە ئەمڕۆ لە کرمانجی یان کوردیی سەرووا، بە هۆی بەکارهێنانی ئەلفبێی لاتینی-تورکییەوە، کوژراون. گەرووی خوێندەوارانی کورد، بە هۆی نەهێشتنی ئەو دەنگانەوە، بە جۆرێک شێوێندراوە، کە مرۆڤ کاتێک گوێی لە هەندێک دەنگ و وشەی کوردی دەبێت پێکەنینی دێت. راستە هەندێک لەو دەنگانە لە بنەڕەتدا کوردی نەبوون، بەڵام بە درێژایی سەدان ساڵ و بە هۆی

تێکەڵی کولتووریی کورد لەگەڵ عەرەب و فارسدا، ئەو دەنگانە لەگەڵ زمانی کوردیدا گونجێندراون و بوونەتە کوردی. لە ڕێگای هەزاران وشەوە، کە لە ژیانی ڕۆژانە و ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا چەسپاون، بوونەتە بەشێک لە ئەلفوبێی کوردی و گەرووی مرۆڤی کورد بە جۆرێکی سروشتی لەگەڵ ئەو دەنگانەدا ڕاهاتوون. بۆ نمونە دەنگەکانی وەک (ح، ع، غ، ق، ڵ، ڕ، وێ) بۆیە مەسەلەکە بە تەواوی پێچەوانەیە و ئەلفبێی لاتینی، کە کوردی باکوور ناچاری بەکارهێنانی کراون، لەگەڵ تایبەتمەندی زمانی کوردیدا ناگونجێت و ئەو دەنگانەی لە سەرەوە هاتوون، لە نووسینی لاتینی-تورکیدا وێنەیان بۆ دانەندراوە. لەبەر ئەوە دەبینین کوردی باکوور، تەنانەت بە ئەلفوبێی لاتینیش ناتوانن بە دروستی خانی و مەلای جزیری بخوێننەوە، ئەگەر بشتوانن، بە زەحمەتێکی زۆرەوە، بیخوێننەوە ئەوا تێی ناگەن. ئەمە بەرهەمێکی ڕاستەوخۆی پرۆسێسی کۆلۆنیالییانەی بەنامۆکردنی کوردی باکوورە بە زمان و کولتوورە نەتەوەییەکەی. ئاشکرایە سەپاندنی ئەلفوبێی لاتینی بەسەر کوردی باکووردا گەورەترین و بەکارترین ئامرازی ئەم بەخۆنامۆکردنە کولتووری و زمانییە بووە، چونکو ئەلفوبێیەکە و زمانی تورکی، شارەگی ئایدیۆلۆجیای شۆڤێنیستیی کەمالیزم پێک دەهێنن.

*** بە ڕای تۆ تا ئێستا لە لایەن دەستەیەک یان کەسایەتیەکی باوەڕپێکراوی کوردەوە بە عەقڵێکی بابەتییانە بیر لەم مەسەلەیە کراوەتەوە -مەسەلەی گۆڕینی ئەلفوبێی کوردی بۆ لاتینی- یاخود دەچێتە خانەی کاریگەری جیهانگیری یان لاسایی کوێرانە؟**

-- هەر کەسێک بۆ ئەوەی لە بواری زمانی کوردیدا کەسایەتییەکی باوەڕپێکراو بێت، پێویستە بە باشی شارەزای زمانی کوردی بێت، بە هۆی شارەزایی و پسپۆڕی و کارە زانستی، یان

ئەدەبییەکانییەوە، ئەو متمانەیەی بەدەست هێنابێت. بە رای من هەر کەسایەتییەکی لەو جۆرە، ئەگەر ئۆبجێکتیڤانە، بە دوور لە فشار و کارتێکردنی سیاسی بۆ ئەم مەسەلەیە بڕوانێت، ناتوانێت داوای گۆڕینی ئەلفوبێی کوردی، بە ئەلفوبێی لاتینی بکات. چونکو ئەم بۆچوونە، لە رووی زانستیی زمانەوە، لەگەڵ سروشتی زمانی کوردی و تایبەتمەندیی دەنگەکانیدا ناگونجێت. لەمەیش زیاتر گۆڕینی ئەلفوبێ تەنیا مەسەلەیەکی تەکنیکی نییە، بەڵکو پەیوەندی بە ستروکتووری زمانەوە، وەک سیستمی بیرکردنەوە هەیە. دەشێت مرۆڤ لە زۆر مەسەلەدا، وەک بەشێک لە ئازادیی خۆی، کوێرانە، یان بە ئاگاییەوە لاسایی رۆژئاوا بکاتەوە، بەڵام مەسەلەی گۆڕینی ئەلفوبێ، یاریکردنە بە رابردووی کولتووری و ئێستا و داهاتووی نەتەوە، بۆیە بۆ لاساییکردنەوە قبووڵ ناکات.

**• کورد وەک نەتەوەیەک هەر دەبێ رۆژێک لە رۆژان چ زمانی ئەدەبی، چ ئەلفوبێی نووسین یەک بخات، بە رای تۆ دواجار چارەسەر چییە؟ کورد دەبێ بۆ ئەو ئەرکە حەتمی و گەورەیە چی بکات؟**

– یەکخستنی زمانی ئەدەبیی کوردی، وەک رزگاربوون و یەکخستنەوەی کوردستان، خەون و ئاواتی هەر مرۆڤێکی کوردە، بەڵام بە رای من ئەم یەکخستنەی زمانی کوردی (دیارە مەبەست یەکخستنی کوردیی خواروو و سەروویە) کارێکی سەختە. ئەمەیش لەبەر نەبوونی دەوڵەت و دەوڵەتی یەکگرتووی کوردی نییە، بەڵکو لە بنەڕەتدا لەبەر ئەوەیە کە ئەم دوو شێوە زمانە، لە رووی رێزمان و رستەبەندییەوە جیاوازییان هەیە. ناکرێت لەم دوو شێوە زمانە، زمانێکی نوێ دروست بکرێت. بە تایبەتیش کە زمان بەرهەمی کۆمەڵ و ژیانە و ناکرێت لە کارخانە و بە بڕیار دابتاشرێت. لە هەمان کاتدا ئەم دوو شێوە زمانە هەر یەکەیان بە جۆرێک رەوشی گەشەکردنی

خۆی گرتووە کە بە راستی لە دوو زمان، نەک دوو دیالێکت یان شێوە زمان، دەچن. لە رووی زانستی زمانە سنوورێکی روون لە نێوان زمان و دیالێکتدا نییە. هەر دیالێکتێک، ئەگەر رێزمان و دەستوورەکەی نووسرایەوە، فەرهەنگی بۆ داندرا و ئەدەبیاتی پێ نووسرا دەکرێت بگۆڕدرێت بە زمان، یان بە زمانێک دابندرێت. بە رای من هەر کام لەم دوو شێوە زمانە، لە روانگەی زانستی زمانەوە، هەموو مەرجەکانی زمانی سەربەخۆیان تێدایە، بەلاّم هێشتا ئێمە قسە لە دوو شێوە زمانی کوردی، نەک دوو زمان دەکەین، چونکو ئێمەی کوردی باشوور و باکووری کوردستان، لەگەڵ جیاوازی شێوەزمانەکەمان، خۆمان بە کورد دەزانین. ئەمە لە رووی سیاسییەوە بایەخێکی زۆری هەیە، بەلاّم بە تەنیا ناتوانێت رێگە بۆ دروستبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو خۆش بکات. بە رای من نابێت لەوە بترسین کە کورد، لە ئاستی کوردستاندا، بە دوو شێوەزمان، یان دوو زمان بنووسێت. بەلاّم زۆر گرنگە کار بۆ لێکنزیکردنەوەی ئەم دوو شێوەزمانە و نزیکبوونەوەی کولتووری و هەماهەنگیی نەتەوەیی بکرێت، بۆئەوەی لە لایەکەوە جیاوازیيە زمانی و کولتوورییەکانی نێوان بەشەکانی کوردستان کەمتر بکرێنەوە، لە لایەکی تروە گەلی کورد، لە هەر بەشێکی کورستاندا بێت، ئاسانتر لە شێوەزمانی یەکتری بگەن. رەنگە گرنگترین هەنگاوێک، وەک سەرەتا، بۆ نزیکبوونەوەی زمانی و کولتووری یەکخستنی ئەلفوبێ، بەکارهێنانی ئەلفوبێی کوردی بێت لە باکووری کوردستاندا، کە دیارە تەنیا گەلی باکووری کوردستان خۆیان دەتوانن بڕیاری لەو جۆرە بدەن. ئەم کارە لە چوار لایەنەوە گرنگە:

**یەکەم:** گەلی باکووری کوردستان بە ریشەی کولتووری و مێژووی ئەدەب و نووسینی خۆی ئاشنا دەکرێتەوە و لەو دابڕان و نامۆبوونە کولتوورییەی تورک بەسەریدا سەپاندووە، دەرباز دەبێت.

**دووەم**– کوردی باکوور دەتوانێت سوود لەو سامانە ئەدەبی و کولتوورییە فراوان و هەمە لایەنە وەربگرێت کە دووسەد ساڵە، بێ دابڕان، بە شێوەزمانی کوردیی باشوور دەنووسرێت، هەروا دەتوانێت بەبێ گرفت ئاگاداری ئەدەبیاتی ناوچەی بادینان بێت. ئەو سامانە کولتوورییە نەتەوەییە لە بواری ئەدەب، هونەر، زانین و زانستدا، لە ڕەوشی بەردەوامبوون و گەشەکردنیدا، بنەمای فیکری و ئیستاتیکی و کەسایەتیی مرۆڤی کورد و نەریت و پرینسیپە هونەرییەکانی ئەدەبی کوردی داڕشتووە. بۆیە ناکرێت مرۆڤ بە کوردی بنووسێت و ئاگاداری ئەو سامانە کولتوورییە نەبێت. لە هەمان کاتدا کوردی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەتوانن بە بەرهەمی نووسەرانی باکووری کوردستان ئاشنا ببن.

**سێیەم**– ڕاستە هەردوو زاراوە، یان شێوەزمان، وەک لە سەرەتادا ئاماژەم بۆ کرد، جیاوازیی زۆریان هەیە، بەڵام بە ڕای من ئەلفوبێی لاتینی جیاوازییەکەی زەقتر و زیاتر کردووە و دیوارێکی لە بەردەم نزیکبوونەوەی ئەم دوو شێوە زمانە هەڵچنیوە کە بە هۆیەوە دابڕانی کولتووری و زمانیی لە نێوان کوردی باکوور و کوردی باشوور و ڕۆژهەڵات زۆرتر بووە. بۆیە هەر هەوڵ و کۆششێک بۆ نزیکبوونەوەی کولتووری و زمانی و هەماهەنگی (ئینتێگراسیۆن)ی نەتەوەیی لە نێوان ئەو بەشانەی نەتەوەکەماندا، بە بێ یەکخستنی ئەلفوبێ، واتا بە بێ گەڕانەوەی کوردی باکوور بۆ ئەلفوبێی کوردی، ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت.

ئێمە لەم ڕووەوە ئەزموونی هەندێک گەلانی سۆڤییەتی هەڵوەشاوەمان هەیە. لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر، دەوڵەتی سۆڤییەت ئەلفوبێی کیریلی بەسەر هەندێک گەلانی سۆڤیەتدا، لەوانە گەلانی

تورکزمان تاجیک، سەپاند. ئەگەرچی، لە ماوەی حەفتا ساڵی دەسەڵاتی سۆڤیەتدا، ئەو گەلانە بە دەیان هەزار کتێبییان لە بواری جۆراوجۆری زانین و زانست و ئەدەبدا بەو ئەلفوبێیە بڵاو کردبۆوە، کەچی دوای هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەت، گەلانی تورکزمان، دەستبەرداری ئەلفوبێی کیریلی بوون. من چەندان جار ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ هەندێک رووناکبیری باکووری کوردستاندا باس کردووە، بەڵام ئەوان، ئامادە نین تەنانەت مناقەشەی ئەم مەسەلەیە بکەن، چونکو ئەلفوبێی لاتینی لای ئەوان و رووناکبیرانی تورک، پیرۆز کراوە، باوەڕیان بەو وەهم و خورافەیە هێناوە کە ئەوان ئەوروپایین، بۆیە دەبێت بە ئەلفوبێی ئەوروپایی (لاتینی) بنووسن. ئاشکرایە ئەمەیش ئەنجامێکی تری ئایدیۆلۆجیای کەمالیزمە لە تورکیا و باکووری کوردستاندا.

**چوارەم:** ئەلفوبێی کوردی، لە باکووری کوردستاندا، دەتوانێت ببێتە یەکێک لەو توخمە کولتوورییانەی کە کورد لە تورک جیا بکاتەوە. ئێمە زمانەکەمان پێناسە (هەویە)ی نەتەوەییمانە و گرنگترین (رەنگە تاکە) توخمی کولتوورییە کە لە تورک، عەرەب و فارس جیامان دەکاتەوە. ئەگەر ئێمە زمانەکەمان لە دەست بدایە ئەوا دەمێک بوو لە نێو ئەو گەلانەدا توابووینەوە. زمانی کوردی لە باکووری کوردستاندا، کە شەڕی مان و نەمان دەکات، بە تەواوی لە بەردەم زمانی تورکیدا پاشەکشەی کردووە. ئەمڕۆ زۆرینەی کوردی باکوور زمانەکەی خۆیان لە بیر براوەتەوە و تەنانەت لە ئەوروپایش، بە زمانی تورکی دەدوێن و بیر دەکەنەوە. بەکارهێنانی ئەلفوبێی کوردی لە باکووری کوردستاندا، قورساییەکی زیاتر بە زمانی کوردی دەدات، وەک تاکە فاکتەری خۆجیاکردنەوە لە تورک. رەتکردنەوەی ئەلفوبێی لاتینی-تورکی، کە بەشێکە لە ئایدیۆلۆجیای کەمالیزم، تەحەدایەکی

گەورەی کەمالیزم و سیاسەتی کوشتنی زمانی کوردییە، کە دەیان ساڵە دەوڵەتی تورکیا پەیڕەوی دەکات.

*** بە حوکمی ئەوەی بەڕێزتان شاعیرێکی گرنگی کوردن، ئەو گەنجینە گەورەیەی شیعری کلاسیکی کوردی، کە بەشی زۆری ستاتیکا و گەمە زمانەوانییەکانیان بە شێوە و شێوازی تیپی کوردی هەڵچنراوە، گۆڕینی ئەم ئەلفبێیە نابێتە هۆی کوشتن و نەمانی ئەو جوانییانە؟**

-- شیعری کلاسیکی کوردی، کە بە سێ شێوەزمانی کوردیی سەروو، گۆران (هەورامی) و کوردیی خواروو نووسراون، هێشتا گرنگترین میراتی ئەدەبی و جوانترین سامانی ئەدەبی و زمانیی کوردن. زمانی کوردی بۆیەکەمین جار لە ڕێی ئەو شیعرانەوە، لە زمانی پەیڤین و قسەکردنەوە گۆڕدرا بە زمانی نووسین. ئەم گۆڕانە گەورەیە، کە نیشانەی خۆناسینی نەتەوەیی و شانازیکردنە بە زمانی نەتەوەییەوە، لای زۆر نەتەوەی تریش (فارس، ئیتالی، هەنگاری، ئۆکراینی ..تاد) سەرەتا بە شیعر دەستی پێ کردووە. دواتر زمانەکە، لە زمانی شیعرەوە گۆڕدراوە بە زمانی نووسینی بابەتی فیکری و زانستی. ئەم شیعرە کلاسیکییانە، وەک شیعری کلاسیکیی گەلانی تری ڕۆژهەڵات، پشت بە هونەری ڕەوانبێژی هونەری وێنەی شیعری، بە تایبەتی جیناس و تیباق و لێکچوون و میتافۆر و ڕەمز و هونەری یاریکردن بە وشە و هەندێ جار بە تیپەکان، دەبەستێت. نووسینی ئەو تێکستە کلاسیکییانە بە ئەلفوبێی لاتینی بەشێکی گرنگی لایەنی هونەری ڕەوانبێژی و هونەری گەمەکردن بەزمان و تیپەکان و لایەنی ئیستاتیکی شیعرەکان دەشێوێنێت، لە هەمان کاتدا ئەم تێکستانە پڕیەتی لە وشە و واژەی خوازراوی ئەدەبی و فیکری و فەلسەفی، کە بە ئەسڵ عارەبین، بەهۆی کولتووری ئیسلامییەوە

هاتوونەتە نێو زمانی کوردی و فارسی و تورکیشەوە. ئەم وشە و واژە خوازراوانە، کە بوونەتە بەشێک لە زمانەکەمان، دەنگی ئەوتۆیان تێدایە کە بە ئەلفوبێی لاتینی وێنەیان بۆ دانەندراوە. بۆیە نووسینیان بە ئەلفوبێی لاتینی ماناکانیان تێک دەدات و جوانییەکەیان دەشێوێنێت. هەروا ئەم تێکستانە لە ریشەی کولتووری و سیاقی مێژوویی و ئێپستیمیی خۆیان دادەبڕێن.

* ئەنجامدانی: ڕەوشت محەمەد

## زمانی یەکگرتووی کوردی‌و
## گرفت‌و ئاستەنگ‌و ڕێگا چارەسەرییەکانی

*** بەڕێزت زمانی ستاندارد چۆن پێناسە دەکەی‌و مەبەست لە زمانی ستاندارد چییە؟**

-زمانی ستاندارد لە ناوەڕۆکدا ئەو زمانە ئەدەبییەیە کە لە ڕەوشێکی مێژوویی ژیانی نەتەوەدا دەردەکەوێ. گەشە دەکات، پێش دەکەوێت‌و بڵاو دەبێتەوە. سەرەنجام لە ناوچەو هەرێم‌و شوێنە جۆراوجۆرەکانی وڵاتدا خۆی دەسەپێنێ. دواتر ئەو زمانە لە ڕەوشی گەشەکردنی نەتەوەدا دەبێتە زمانێکی گشتی، یان مۆرکی زمانی گشتی وەردەگرێت، ئیدی ئەو زمانە ستاتووسی زمانی ستاندارد پەیدا دەکات. دواتریش بە بڕیارێکی سیاسی، لە لایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە، یان پەرلەمانەوە، دەکرێتە زمانی ستانداردی نەتەوەو لە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت‌و سیستمی خوێندن‌و ڕاگەیاندندا بەکاردەهێنرێ‌ت دەبێتە ئەو داوە بەهێزەی کە تەواوی ئەندامانی نەتەوەو ناوچەکان، لە ڕووی کولتوورییەوە، لە ڕووی لێک تێگەیشتنەوە، لە ڕووی وەرگرتنی زانیارییەوە پێکەوە دەبەستێتەوە.

*** پێت وایە زمان پێش ئەوەی کە ببێتە زمانێکی نەتەوەیی، واتە دەبێ ئەو پرۆسە زمانە ئەدەبییە تێپەڕ بکات، دوایی بڕواتە ناو قۆناغێکی نەتەوەیی دیکەوە. ئاخۆ زمانی کوردی ئەو قۆناغەی تێپەڕاندووە کە ئێمە بتوانین بڵێین بەرەو زمانێکی ستاندارد دەڕوات؟**

- راستییەکەی هەر زمانێک لە کۆمەڵێک دیالێکتیک پێک دێتو کاتێک فاکتەری جیۆگرافیو سیاسی بەشەکانی نەتەوەیەک لە یەکتر دابڕێ، ئەمە لە رەوشێکی مێژووییدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دیالێکتەکان دروست ببنو بە جیا لە یەکتر، لە ئاخاوتنو قسە کردندا، گەشە بکەن. کاتێک نەتەوەیەک دەگاتە ئەو ئاستەی کە بتوانێت هزرو بیرو جیهابینیو هەستی خۆی بە نووسین دەربڕێ، زمانی ئەدەبی سەر هەڵدەدات. زمانی ئەدەبی لەیەک کاتدا لە هەموو ناوچەکانی وڵاتەکەدا دەست پێناکات، ناوچەیەک یان چەند ناوچەیەک، کە دیالێکتێک یان چەند دیالێکتێکی تێدا زاڵە، لە رووی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتییەوە لە ناوچەکانی تر دەرفەتی گەشەکردنی زیاتری بۆ رەخساوە، دەستەی خوێندەوارو رووناکبیر لەو ناوچەیە زیاتر پێگەیشتوون، ئەم دەستە رووناکبیرە دەست بە نووسین دەکەن یا دەیانەوێ هزرو بیرو هەستو جیهانبینی خۆیان لە رێی نووسینەوە دەربڕن، لێرەوە زمانی نەتەوە لە زمانی ئاخاوتن و قسەکردنەوە دەگۆڕدرێت بۆ زمانی نووسینیش. لەم رەوشەدا بێگومان ئەو ناوچەیەی کە ئەو زمانە ئەدەبییەی تێیدا دەرکەوتووە دیالێکتێک یان چەند دیالێکتێکی ئەو ناوچەیە، دەبێتە بناغەی ئەو زمانە ئەدەبییە، بەڵام سروشتی زمانی ئەدەبی، لای هەموو نەتەوەو گەلان، ئەوەیە کە بۆ ئەوەی بتوانێ بەردەوام بێ، بۆ ئەوەی بتوانێ شێوەی زمانی یەککگرتوو وەربگرێ، تەنیا خۆی لە ناوچەکانی تر کە بە دیالێکتی تر دەدوێن، بڵاو ناکاتەوە، بەڵکو لە رەوشی یان لە پرۆسێسی خۆ بڵاوکردنەوەدا، هەندێک تایبەتمەندیو سروشتی دیالێکتەکانیش

وەردەگرێ. لە رووی زاراوەوە رەستەبەندییەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەندێک دیالێکتی تر. بەم شێوەیە زمانی ئەدەبی وردەوردە جێگای خۆی لە ناوچەکانی دەرەوەی خۆیدا دەکاتەوە، ئەم پرۆسێسەش بە جۆرێکی سروشتی، رەوشی گەشەکردنی سیاسیو کولتووریو زمانیی نەتەوەکە خۆی دروستی دەکاتو دەیسەپێنێ. لێرەشەوەیە زمانی ئەدەبی دەگۆڕدرێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەتەوەکە. هەر ئەوەشە دواتر، وەکو وتم، بە بڕیارێکی سیاسی دەگۆڕدرێ بە زمانی ستاندارد یان زمانی رەسمی، یان زمانی دیوانیی دەوڵەت. یان زۆرجار پێش ئەوەی زمانەکە، بە بڕیاری سیاسی، بگۆڕدرێ بە زمانی ستاندارد، رۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێ، جەنابت باسی زمانی کوردیت کرد، ئەگەر سەیری زمانی کوردی بکەین، ئێمە ئەمڕۆ زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیمان هەیە کە لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا بۆتە زمانی نووسین، زمانی رۆژنامەوانی، زمانی خوێندن، زمانی حکوومەتو هەر دەسەڵاتێکی کوردی، کە بەلای کەمەوە لەم هەشتا، سەد ساڵەی دواییدا پێکهێندراوە. ئەمە بە بڕیاری سیاسی کەس نەبووە، بەڵکو رەوشی گەشەکردنی سیاسی و کولتووریی کورد ئەمەی سەلماندووە. کاتێک کورد، پێش زیاتر لە هەشتاوپێنج ساڵێک، لە سلێمانی حکوومەت دادەمەزرێنێ، ئەو زمانە ئەدەبییە بەکاردەهێنێت، کە سەد ساڵ پێش ئەوە لە باشوورو رۆژهەڵاتی کوردستاندا دەرکەوتووە. دواتر کاتێک کۆماری دێموکراتیکی کوردستان لە مەهاباد دێتە دامەزراندن، پێشەوا و حکوومەت و دەزگاکانی کۆمار، لە لە بەڕێوەبردن و خوێندندا، لە رۆژنامەوانیدا، هەمان ئەو زمانە بەکاردەهێنن، بەبێ ئەوەی بڕیارێکی سیاسی لە پشتەوە بووبێت. دوای راپەڕین بە هەمان شێوە.

ناسیۆنالیزمی کورد، بە درێژایی سەدەی بیستەم لە باشوورو رۆژهەڵاتی کوردستاندا، لە ئەدەبیات و وتاردانیدا و لە کار و

چالاکییەکانیدا هەر هەمان ئەو زمانە بەکاردینێت کە ئێستا من و تۆ پێی دەدوێین. هەموو حیزبە کوردستانییەکان لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان بەرنامەیان، پرۆگرامیان، بڵاوکراوەکانیان بەم شێوە زمانەیە. بزاڤی چەکداری ئەیلوول‌و دەسەڵاتەکەی، ئەمرۆ حکوومەتی کوردستان، پەرلەمان، سەرۆکایەتیی پەرلەمان سەرۆکایەتیی هەرێم و حکوومەت، هەموو دەزگاکانی ئێمە ئەم زمانە لە نووسین‌و وتاری رەسمیدا بەکار دەهێنن. لێرەوە ئەو زمانە بۆخۆی لە رەوشی گەشەکردنی نەتەوەکەماندا ئەو پلەوپایە (ستاتوسە)ی پەیدا کردووە، یانی زمانەکە خۆی، بەهۆی ئەو توانای دەربڕینەی هەیەتی، بەهۆی ئەو دینامیکیەتی گەشەکردن و پێشکەوتنەی، کە لەگەڵ رەوشی گەشەکردنی کۆمەڵی کوردستاندا رۆیشتووە، بەهۆی ئەو هەموو بابەتە زانستی، ئەدەبی، فکری، فەلسەفی و ئابوورییەی پێی نوسراوە، سەلماندوویەتی کە شایستەی ئەوەیە زمانی نەتەوەیەک بێت، شایستەی ئەوەیە ئاستی پێشکەوتنی کولتووری و فیکریی نەتەوەکە پیشان بدات. تۆ لە رێگەی زمانی کوردییەوە، زۆر بە ئاسانی، دەتوانی بزانی کورد لە رووی سیاسییەوە لە چ ئاستێک دایە، یان کولتوور و ئەدەبەکەی لە چ ئاستێک دان، ئاستی هزری، ئاستی زانستی و خوێندەواریی کورد، تێکڕای ئەمانە لە زمانەکەیدا دەبیندرێن. لە هەموو نەتەوەیەکیشدا هەر وایە. لەبەرئەوە زمانی ئێمە وەکو وتم، لە رەوشی خەباتی سیاسی و کولتووری و کۆمەڵایەتیی گەلی کوردستاندا، بەم شێوەیە گەشەی کردووە. ئێمە کە چاو دەکەینەوە کێوێک لە میراتی کولتووری، ئەدەبی و فیکری دەبینین، کە بەو زمانە هاتۆتە بەرهەم، ئێمەیش یان نەوەی دوای ئێمەیش درێژە بەوە دەدەن.

**-* دوکتور جەنابت پێت وایە، هەر لە قسەکانیشدا وا دەرکەوت، کە ئەو تایبەتمەندیانە ئەو سروشتەی ئەمڕۆ زمانی کوردییان گەیاندوتە ئەو ئاستە، هەڵبەتە تایبەتمەندییەکانی خۆی بوون، بەڵام ناوەندێکی بڕیاردەری حکوومی لە پشت نەبووە، کە بیگەیەنێتە ئەو ئاستە، هەر کەس لە ئاستی رۆشنبیران، شاعیران، نووسەران و دڵسۆزانی کورد گەیاندویانەتە ئەو ئاستە دەتوانین بڵێین هەر زمانێک تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەیە. بەڕای جەنابت تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی زمانی کوردی کامانەن؟**

- تایبەتمەندیی یەکەمی زمانی کوردی ئەوەیە کە لە هیچ زمانێکی دیکە ناچێت، دووهەم تایبەتمەندیی ئەوەیە کە بە ڕاستی زمانێکی شیرینە، زمانێکی ناسکە، زمانێکە زۆر بە ئاسانی خەڵکی بیانی دەتوانێ فێری بێت، لە هەمان کاتدا زمانێکە دینامیکیەتێکی بەهێزی پێشکەوتن و گەشەکردنی تێدایە. زمانی کوردی یەکێک لە شتە جوانەکانی ئەوەیە، چۆن وشە، یان قسە دەوترێت، بە هەمان شێوە دەنووسرێت، لە کاتێکدا هێندێک زمانی تری دنیا، بۆ نموونە فرەنسایی، جاری وایە وشەیەک دە پیتە تۆ سێ چوار پیتی دەخوێنیتەوە، زمانی کوردی زمانێکە سیستمی نووسینی و سیستمی دەنگییەکەی، مۆسیقا و هارمونیایەکی زۆر شاعیرانە و جوانی تێدایە. هەروا زمانی کوردی ئەو تایبەتمەندییەی تێدا هەیە، کە لەگەڵ ئاوەزی مرۆڤی کورددا لەگەڵ شێوە و سروشتی ژیانەکەیدا، لەگەڵ شێوەی پێشکەوتنەکەیدا، بە جۆرێکی دینامیکی و ڕێکوپێک رۆیشتووە. جگە لەوە زمانی کوردی بەو ئەلفوبێیەی کە پێ دەنووسین، کە لە بنەڕەتدا ئارامییە، عەرەب و فارس‌و دەری و نەتەوەی تریش بەکاری دێنن. بەڵام ئەم ئەلفوبێیە، لە زمانی کوردیدا هەموار کراوە و لەگەڵ تایبەتمەندیی زمانی کوردیدا، گونجێندراوە. سیستمی دەنگی و

سیستمی نووسینی کوردی، هارمونیا و تەباییەکی گونجاوی تێدایە و گرفتی تیپە دەنگدارەکان (ڤۆکاڵەکان) لە نووسینی کوردیدا چارەسەر کراون، کەچی بە پێچەوانەوە لە عەرەبی و فارسی و دەریدا، هێشتا ئەو گرفتانە هەن. زۆر جار زەحمەتە کەسێک، ئەگەر مانای وشەیەک نەزانێت، بتوانێ وشەکە بە دروستی بخوێنێتەوە. جەنابیشت فارسی دەزانی، وشەیەکی فارسی، ئەگەر نەزانی ماناکەی چییە زۆر بە ئاسانی دەکرێت بە هەڵە بـیخوێنێتەوە زمانی عەرەبییش وایە، چونکە دەنگە ڤۆکاڵەکان، تیپە دەنگدارەکان، نانووسرێن، لە جیاتیان سەر و بۆر و ژێر بەکار دەهێنرێن، کە ئەوانیش زۆرجار نانووسرێن. لە کوردیدا ئەم گرفتانە چارەسەرکراون. ئەمە بە بەشێکە لە جوانی زمانی کوردی، بەشێکە لە دینامیکیەتی پێشکەوتنی زمانی کوردی، کە ئێمە لەو گرفتانە دەرباز بووین.

*** واتە بە پێی ئەو شتەی باست کرد سروشتیش کاریگەری لەسەر زمانی کوردی زۆر هەبووە، سروشتی کوردستان، هەڵکەوتی جوگرافیایی، بە پێ ئەو هەست و نەستەی کورد لەگەڵ روحی شاعێرانەدا زۆرتر هاتۆتەوە زمان و کاریگەریی لەسەر فۆنۆتیک و دینامیکی زمانەکەشدا نەبووە، وایە؟**

- بێگومان سروشت کاریگەریی زۆری بووە. زمانی کوردییش زمانێکە مۆسیقا و ریتمێکی تایبەت بە خۆی هەیە. من لە دەرەوە، لە زۆر وڵاتی بیانی کە بۆ شیعر خوێندنەوە بانگ کراوم، بە کوردی هەندێ شیعرم خوێندۆتەوە، وتووشمە بۆ ئەوەی ئاوازی زمانەکەتان گوێ لێ بێت، دواتر ئامادەبووان زمانەکەیان بەلاوە زمانێکی پڕ مۆسیقا و سەرنجڕاکێش بووە. هیچ وشەیەک نییە لە کوردیدا ریتمێکی نەبێت، کە نەتوانێ وەزنی بۆ دابنێیت، تۆ کە دەڵێی، بۆ نموونە رەفیق سابیر. یەکسەر ئەم دوو وشەیە، هەریەکەیان دوو

برگەیە. وشەی کوردی ریتمیکی مۆسیقیی ناوەکیی تێدایە کە زۆرجار، لەگەڵ دەنگی ڤووکاڵەکاندا، ئەم مۆسیقایە رەوشێکی تایبەت بە خۆی دەگرێت.

*** مامۆستا ئێمە زیاتر با بڕۆینە سەر شێوازەکانی پەرەپێدانی زمانی کوردی و ئەو قۆناغە و ئەو پرۆسەیە کە دەبێ زمانی کوردی بەرەو ستاندارد ببات، با باس لەسەر ئەوە بکەین، جەنابت پێت وایە، ئەم زمانە، زمانی کوردی چۆن دەبێتە زمانێکی ستاندارد، ئەو ئامراز و کەرەسانەی کە پێویستن بۆ بە ستاندارد بوونی زمانی کوردی جەنابت چۆنیان دەستنیشان دەکەی؟**

- بەڵێ: بەڕێزتان دەزانن، کە ئەمڕۆ، لە کوردستاندا سێ شێوە زمان لە نووسیندا، بەکار دێت، شێوە زمانی کوردیی باکوور، کە بە شێوە زمانی یان بە چەند دیالێکتی کوردیی باکوور بە تیپی لاتینی دەنووسن و هەر لە باکوور ئەو گرفتەیان هەیە، هەندێک لە زازاکانیش کە بە شێوەزمانی زازا، دیالێکتیکی کوردییە دەنووسن، کوردی باشوورو رۆژهەلاتیش، بەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە دەنووسین کە ئەوە دووسەد ساڵ زیاترە لە ئەدەبی کوردیدا دەرکەوتووە. هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیشیدا شاعیران لە سنە سالمی سنە، لە مەهاباد و موکریان وەفایی، لە کەرکووک شێخ رەزا، لە کۆیە حاجی قادر، لە سلێمانی نالی و کوردیو سالم، پێیان نووسیوە. بە بۆچوونی من هەر قسەکردنێک لە زمانێکی ستاندارد بۆ هەموو کورد و هەموو کوردستان قسەیەکە ئەنجامێکی کونکرێتی نابێت. چونکە ناتواندرێت، لە شێوە زمانی کوردیی باکوور و باشوور زمانێک دروست بکەی. زمان لە رەوشی سروشتی و مێژوویی نەتەوەدا گەشە دەکات و وەک زمانی ئەدەبی گۆڕانی بەسەردا دێت. بێجگە لەوەش ناتواندرێت ئەو کارە بکرێت، ئەگەر بشتوانرێ بکرێ،

کە ناکرێ، ئەو دەسەڵاتە سیاسییە نییە، لە باکووری کوردستان‌و لە هەموو کوردستاندا ئەو زمانە ستاندار دە بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ،. ئەمڕۆ زمانی کوردی لە باکووری کوردستان ئازاد نییە، گەلەکەشی ئازاد نییە، زمانەکەی رووبەڕووی کوشتن دەبێتەوە، گەلەکەشی رووبەڕووی ستەمکارانەترین شۆڤێنیزمی دەوڵەتی دەبێتەوە. لەو حاڵەتەدا تەنیا کوردی باکوور، سبەینێ کە خۆیان‌و زمانەکەیان ئازاد دەبن، دەتوانن بڕیار بدەن چ شێوە زمانێک بۆ نووسین بەکاردەهێنن. ئێمە ئەمڕۆ لە باشوور و رۆژهەلاتی کوردستاندا هیچ چەپەرێکی ئەوتۆمان لەبەردەمدا نییە بۆ ئەوەی ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە، وەک زمانی ستانداردی کوردی بە فەرمی بناسرێ، دەڵێم بە فەرمی بناسرێ، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو زمانە هەیە و ستاتووسی زمانی ستانداردی هەیە و رۆڵی زمانی ستاندارد دەگێڕێت، سەدەیەک زیاترە، وەکوو باسم کرد، ئەو رۆڵە دەگێڕێت، بەلام زۆر گرنگە کە هەوڵ بدرێت ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە، لەگەڵ شێوە زمانی کوردیی باکوور لێک نزیک بکرێنەوە، هەوڵ بدرێت لە رووی زاراوە و لە رووی هێندێک شتی ترەوە کە ئەمە مەسەلەیەکی زمانی رووتە، لەیەک تری نزیک بکرێنەوەو هەرکامەیان بە وشەو زاراوەی ئەوەی تر دەوڵەمەندتر بکرێن. بۆیە ئێمە کە قسە لە زمانی ستاندارد دەکەین، قسە لە ئیمکانییەتی ناساندن و بەرەسمیکردنی زمانی ستاندارد دەکەین، کە ئەمڕۆ لە باشووری کوردستاندا ئەو ئیمکانییەتە هەیە و دەشتوانرێ کاری بۆ بکرێت. لە هەمان کاتدا دەکرێ دەزگایەکی تایبەت بە زمان، لە کۆمەڵێک خەڵکی پسپۆڕ پێک بێت، کە توانا و دەسەلاتی زانستییان لە بواری زمان و شارەزایی زماندا ئەوەندە بێت، قسەکانیان جێگای رێز و پەسەندی هەموو لایەک بێت، ئەو دەزگایە کار بکات بۆ پاراستنی زمانی کوردی، بۆ گەشەپێدانی، بۆ دەوڵەمەندکردنی بۆ نزیککردنەوەی ئەو دوو شێوە زمانە لە یەکتری،

لە هەمان کاتدا هەوڵێکی زۆر جیدی بدات بۆ ئەوەی دیالێکتەکان، کەلە هەر وڵاتێکدا سامانێکی کولتوورین، بپارێزرێن، تا بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو دیالێکتانە بتوانن درێژە بە خۆیان بدەن.

*** دوکتور هەروەک باسیشت کرد ئێستا ئەو هەلە مێژووییە، ئەو قۆناغە سیاسییە کە لە باشووری کوردستان هەیە بێگومان رۆڵی یەکجار زۆری لە پەرەپێدانی فەرهەنگو ئەدەب و کولتووری کوردیدا هەبووە، لە مێژووی کورددا وەک قۆناغێکی درەوشاوەی کورد دەتوانین چاوی لێ بکەین، بۆ پاراستنیشی دەبێ هەموو هەوڵ بدەین بەڵام لێرەدا کۆمەڵێک ناوەندی حکوومەتی، یان کەسایەتیی فەرهەنگی، ناوەندی رۆژنامەوانی و راگەیاندن بەردەوام رۆژانە لەگەڵ زماندان، کار بە زمان دەکەن، واتە پێشتر سیستمی پەروەردە لێرەدا، سیستمی پەروەردە چ رۆڵێک دەتوانێ ببینێ لە دروستبوونی ئەو پرۆسە زمانە نەتەوەییو زمانە ئەدبییە، یەککگرتووەدا؟**

- بەڵێ، هەر زمانێک بێگومان گرفتی تایبەت بە خۆی هەیە، ئێمە کە باس لەسەر گرفتی زمانی کوردی بکەین، پێویستە پێش هەموو شتێک بۆ گرفتی هەر زمانێک یەکەم: وەکوو پرەنسیپ، گرفتەکان دیاری بکرێن، دووەم: پێشنیاری شێوە چارەسەریان لە رووی زانستیو زمانییەوە بکرێ، سێیەم: کە رۆڵی گرنگ و یەک لاکەرەوە دەبینێ ئەوەیە کە بڕیاری سیاسیی پشتگیری لەو شێوە چارەسەرکردنە بکات. بە واتایەکی تر ئەمە کارێکە پێش هەر شتێک کاری زانایانی زمان و زماننناسانە ئەم گرفتانە دیاری و چارەسەر بکەن. دواتریش پەرلەمان و دەسەڵاتی سیاسی، وەکوو نوێنەری گەل، وەکوو پارێزەری کەرامەت و کەسایەتیی ئینسانەکانو پارێزەری سامانی کولتووری و مادی، بە زمانیشەوە، دێت ئەو بڕیارە جێبەجێ دەکات. گرنگترین شوێن لێرەدا بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانە لە بواری

زماندا جێبەجێ بکرێن، سیستمی پەروەردەیە. دوای سیستمی پەروەردە، دەزگاکانی راگەیاندن و هەموو ئەو دەزگا رەسمییانەی دەوڵەتن، کە زمانەکە لە نووسین و بڵاوکردنەوەدا بەکاردەهێنن، یان نووسراوەی رەسمی و یاسا و بڕیاری پێ دەردەکەن. لەبەرئەوە سیستمی پەروەردە گرنگترین شوێنە، چونکە تاکە شوێنێک کە بتوانی منداڵ لە پۆلی یەکەمەوە، تەنانەت لە باخچەی ساوایانەوە، فێری زمانێکی پاراو و رەوان بکەی، جوانی و موسیقای زمانەکەی تێ بگەیەنی و زمانەکەی لەلا خۆشەویست بکەی باخچەی ساوان و قوتابخانەو خوێندنگەیە. تۆ بەو رادەیەی نەوەیەک پێدەگەیەنی، کە زمانەکە بە باشی بزانی، رەوان، پاک، بە ڕێکوپێکی بیڵێ و پیی بنووسێت، بە هەمان ئەندازە یارمەتی دەدەی، بۆ ئەوەی بتوانی بیرکردنەوەی خۆی بە شێوەیەکی روون، کۆنکرێتی، ڕێکوپێک بەنووسین یان بە پەیڤین، دەرببڕێ. کەواتە پەروەردە گرنگترین شوێنێکە کە تۆ دەتوانی، هەموو منداڵان بە زمانێکی پاراو و رەوان پەروەردە بکەی و بەو شێوەیەی کە گونجاوە، کە پێویستە، نەک بە شێوەیەکی هەڵە، دوای ئەوە، لەوێوە نۆرەی دەزگاکانی تری وەک، زانکۆکان، راگەیاندن و هتد... دێت.

*** دوکتور هەروەک پێشتریش باست کرد لە پێشوودا ئەدیبان و نووسەران بە ناوی دڵسۆزی و پاراستنی زمانەوە هاتوون هەرکەس لە ئاستی خۆی کاری کردووە، ئەوەش ئەمڕۆ، ئەو روانگەیە، ئەو دیدگایە هەر بەردەوامە لە کوردستان، ئێستاش هەر هەیە، هەرکەس لە ئاستی خۆی دێت کاری زمانەوانی دەکات، رای جیاواز لەسەر زمان، لەسەر شێوەی نووسینی زمانی ستاندارد و زمانی یەکگرتووی ئەدەبی باس دەکات. ئەمڕۆ بەو هەموو کەرەستەو ئامرازە راگەیاندنانەوە، جەنابت پێت وایە دەبێ چ بکرێت ئەو کەسایەتییانە**

**هەرکەس لە ئاستی خۆیانەوە نەیەن و بەو شێوەیە نەبێ، بەڵکوو هەموو لە پلان و بەرنامەیەکی تۆکمەی داڕێژراوی یاساییدا واتە روانگەیەکی نەتەوەیی لە پشت پاراستنی زمانەوە بێ دەبێ چ بکەن؟**

- هیچ وڵاتو نەتەوەیەک نییە، سیاسەتێکی نەتەوەیی نەبێت، بەو مانایە سەرجەم تێڕوانینی کۆمەڵ و دەوڵەت و دەزگا مەدەنییەکانی و رووناکبیرانی و خەڵکەکەی لە یەک ستراتیژی و یەک سیاسەتدا چڕ دەکرێتەوە. سەبارەت بە زمان، هیچ نەتەوەیەک ناناسم، جگەلە خۆمان، کە سیاسەتێکی زمانیی روونی لەبارەی زمانەوە نەبێت و لە هەمان کاتیشدا دەزگای جۆراجۆری دانەمەزراندبێت بۆ گەشەپێدانی زمانو پاراستنی. بۆیە بە بۆچوونی من داڕشتنی سیاسەتێکی نەتەوەیی زمانی و پێکهێنانی دەزگای تایبەت بۆ پاراستنو گەشەپێدانی زمانەکەمان یەکێکە لەو رێگا چارەسەریانە. چونکە ئەمڕۆ، لە کۆمەڵی کوردەواریدا، ئاژاوەیەکی یەکجار گەورە هەیە لە بواری رووناکبیری، لە بواری ئەدەبی، لە بواری ئابووری، ئەم ئاژاوەیە زۆر بە زەقی لە زمانیشدا دەردەکەوێت. رۆژانە وشەو دەستەواژە و زاراوەی نوێی فکری، فەلسەفی، زانستی، تەکنیکی، رووبەڕوومان دەبنەوە، هەرکەس بە ئارەزووی خۆی وشەیەک دادەتاشێو زۆرجاریش وشە هەڵەکە دەڕوات و دەبێتە هەڵەیەکی باو و زاڵ لای زۆربەی خەڵک. لە هەموو وڵاتێکدا دەزگای تایبەت بۆ ئەو کارە هەیە. هەر کەسێک بۆی نییە بە هیچ شێوەیەک لە لای خۆیەوە، بە ئارەزووی خۆی بێت بڕیار بدات وشە دابتاشێ. ئەمە زمان ناشیرین دەکات، زەوقی خەڵک تێکدەدات، زمان تێکدەدات. هەروا لە مەسەلەی رێنووسدا، لە بواری رستەبەندیدا لە زۆر بواری دیکەدا، بە ڕاستی گرفتێک دروست بووە بۆ زمانەکەمان. بۆیە زۆر بە داخەوە دەڵێم زمانی کوردی، زمانێکی بێ خاوەنە و تاکوو ئێستا هەوڵی جیددی بۆ نەدراوە.

*** دوکتور بۆ ئەوەی ئێمە ببین بە خاوەنی زمانێک و ئەو سیاسەتە زمانەوانییە کە جەنابت باسی دەکەی، دەبێ ئێمە لە پێشدا ئاستەنگ و گرفتە سەرەکییەکانی زمانی کوردی دەست نیشان بکەین، پاشان لێ بکۆڵینەوە بە شێوەیەکی زانستی، پاشان چارەسەری بکەین، بەڕای جەنابت، ئەو ئاستەنگە سەرەکییانەی کە ئەمڕۆ لە ئاقاری زمانی کوردیو لە مەیدانی ئەدەبی کوردیدا هەن کامانەن کە دەست و پێی زمانی کوردیان بەستۆتەوە؟**

- بە بۆچوونی من یەکێک لە ئاستەنگەکان ئەوەیە کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لە باشووری کوردستاندا هێشتا پلەوپایە (ستاتووسی)ی زمانی ستانداردی پێ نەدراوە. لەبەرئەوە ئێمە دەبینین ئاژاوە و سەرلێشێواوییەکی ئێجگار فراوان هەیە، نەک هەر لە نووسیندا، بەڵکوو لەترسناکترین دەزگای نەتەوەییدا کە سیستمی پەروەردەیە، دەمێک دێن کوردیی باکوور و کوردیی باشوور، لێک دەدەن، گوایا دەیانەوێ زمانێک دابتاشن یان دروست بکەن، هەروەک و ئەوەی بڵێی کە زمان لە کارگەدا دروست بکرێ. لە حاڵەتێکی دیکەشدا هەندێکجار دیالێکتەکان دێن شەڕی زمانی ستاندارد دەکەن. لەو لاوە پاشاگەردانییەکی ئێجگار زۆر هەیە لە شێوەی نووسین لە بەکارهێنانی وشەو زاراوەی سەیر و سەمەرە. لە بواری رستەبەندیدا زۆر جار کە پاراگرافێک دەخوێنیتەوە هەموو وشەکان کوردین، بەڵام لەبەرئەوەی کوردانە دانەڕێژراون، یان بە پێی دەستوورو رێسای زمانی کوردی دانەڕێژراون، هیچی تێناگەی، دەبێ وشەکان لە زەینی خۆتدا بیکەیتەوە بە عەرەبی بۆ ئەوەی بتوانی لێی تێبگەی. ئەمە هەمووی لەگەڵ دووبارەبوونەوە و سەدبارە بوونەوەیاندا زمانەکە دەشێوێنن. بۆیە بە بۆچوونی من ئاستەنگەکان ئێجگار زۆرن و رەنگە لێرەدا شوێنی باسکردنیان نەبێت، بەڵام ئەگەر ئێمە سیاسەتێکی زمانیمان هەبێت، ئەوە کاری زانایانی زمان و

زمانزانانه كه بێن لێكۆڵینەوەی تایبەتی لە بارەی ئەو گرفتانەوە بكەن و پێشنیاری ڕێگەچارەش بكەن. كاتێكیش كە پێشنیار دەكەن و دەوڵەت یان دەسەڵات پشتگیریی لە كارە زانستەكەیان دەكات، ئیتر ئەمە دەگوازرێتەوە بۆ نێودەزگاكانی پەروەردە، زانكۆ، ڕاگەیاندن. لە هەمان كاتیشدا هیچ گرفتێكی زمانی نییە، نەتواندرێت چارەسەر بكرێت، هیچ گرفتێک نییە لە ژیانی نەتەوەیەكدا، كە پەیوەندیی بە خۆیەوە هەبێت، نەتواندرێ چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە. بەڵام گرنگ ئەوەیە یەكەم تۆ بڕوات بەوە هەبێ كە گرفتەكە چارەسەر بكەی، واتا ئیرادەی چارەسەركردن هەبێ. دووەم پلان و ستراتیجییایەک هەبێ بۆ ئەوەی گرفتەكە چارەسەر بكرێت، سێیەم، ستافـو كەرەستەی پێویست هەبێ. هەموو ئەوانە، بە تایبەتی ستافـو كەرەستەی پێویست (كە لێرە قسە لە زانایانی زمانو زمانزانانە) ئەمانە هەن، لەبەرئەوە، ئەگەر ئیرادەی سیاسی هەبێت، دەكرێ دەست بەكارەكە بكرێت.

*** دوكتور باسی ئەوەت كرد كە هەر زمانێک لە چەندین دیالێكت، واتە زاراوە پێک دێت، زمانی كوردیش چەندین دیالێكتی تایبەت بە خۆی هەیە، بەكارهێنانی وشەی زاراوە لەناو زمانی یەككرتوودا ئاخۆ بە قازانجی پەرەپێدانی زمانە یان بەزەرەریەتی جەنابت چۆنی دەبینی، بەكارهێنانی وشەی زاراوە یان شێوەزاری ناوچەیی لەناو زمانی یەككرتوودا؟**

- ڕاستییەكەی هەر نەتەوەیەک زمانەكەی لە كۆمەڵێک دیالێكت یان لەهجە پێكهاتووە ، ئەو زاراوە یان دیالێكتانە بەهۆی زمانی یەككرتوو لەناو ناچن، ڕەنگە هێندێكیان، بۆ نموونە بن دیالێكتەكان لەناو بچن، بەڵام دیالێكتەكان بە گشتی دەمێننەوە، لە قسەكردندا لە گۆرانیدا، لە ژیانی ڕۆژانەدا، هەندێكیان تەنانەت لە نووسیندا درێژە بە خۆیان دەدەن، بۆ نموونە ٢٢ وڵاتی عەرەبی هەیە. جیاوازی نێوان دیالێكتی میسریو دیالێكتی عێراقی زۆر لە جیاوازی نێوان بادینانیو

کوردیی خواروو زیاترە، جیاوازی نیوان هەردووکیشیان لەگەڵ زمانی ستانداردی عەرەبی بە هەمان شێوەیە. هەزار و چەند سەد ساڵە زمانی عەرەبی، زمانی ئەدەبی یەکگرتووی عەرەبی، کە زمانی قورئانە، دەرکەوتووە، بەهۆی قورئانەوە بڵاوبۆتەوە و چەسپاوە. ئەمڕۆ لە هەموو وڵاتانی عەرەبیدا زمانی خوێندنە، زمانی دیوانی (رەسمی)ی دەوڵەتە، زمانی راگەیاندنە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ساڵانە بە هەزاران کتێبو گۆرانیو فیلم، شانۆنامە و کۆمەڵەهۆنراوە بە دیالێکتی عەرەبیی میسری، لوبنانیو عێراقی....تاد بڵاو دەکرێنەوە.

ئەو دیالێکتانە لە رێگای ئەدەبییاتەوە، لە رێگای هونەرەوە درێژە بە خۆیان دەدەن، جوانی خۆیان، توانای دەربڕینی خۆیان پیشان دەدەن، لە هەمان کاتدا لە رێی ئەو تێکستانەشەوە ژیانی هونەری و ئەدەبیی نەتەوەی عەرەب دەوڵەمەندتر دەکەن، هەندێک لەو دیالێکتانە، بۆ نموونە میسری بە رادەیەک بڵاوبۆتەوە کە تەنانەت ژنی ماڵ لە کوردستانیش، کە چاو لە فیلمەکانیان دەکەن، تێیان دەگەن. ئەو ژنانەی ناو ماڵ لە کوردستان خۆ میسریان نەبینیوە، بەڵام لەهجەی میسری لە رێی ئەو فیلمو گۆرانیو ئەو شانۆنامانەی کە کەناڵی تەلەفزیۆنەکانەوە پیشان دەدرێن جێگەی خۆی کردۆتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەس جورئەتی نەکردووە، کە بڵێ دەبێ ئەم زاراوەیە (دیالێکتە) لە میسر، جێگای زمانی ستانداردی عەرەبی بگرێتەوە، یان لە خوێندندا، لە جێگای زمانی ستانداردی عەرەبی بسەپێندرێت. هیچ دەسەڵات و نەتەوەیەکیش لە دونیادا، ئەگەر رێزی خۆی بگرێ، کاری لەو جۆرە ناکات و نایەت زاراوەیەک بێنێ و بیکات بە گژ زمانی ستانداردا و جێگا بە زمانی ستاندارد لەق بکا. هەر زاراوەیەک دەتوانێ بە سەد شێوەی تر درێژە بە خۆی بدات، لە نووسیندا، لە فیلمدا، لە گۆرانیدا لە رۆماندا، توانای خۆی دەرببڕێت. بەڵام هیچ زاراوەیەک ناتوانێ جێگەی زمانی ستاندارد بگرێتەوە،

کەسیش ڕێگەی ئەوە نادات، ئەمە مەسەلەیەکی ترسناکە، بۆ نەتەوەیەکی وەک ئێمە کە هێشتا ژێردەستین و، هێشتا دوژمنان نکوولّی لە بوونی زمانی کوردی دەکەن.

*** دوکتور بەلام بەداخەوە هەروەک ئێمە گرفتی سیاسیمان هەیە بە گشتی کورد ئەوەش لە هەموو بوار و ژانرەکانی دیکەی ئەو نەتەوەیەدا ڕەنگی داوەتەوە، ئیستاش چ بە هاندان بێت، چ بە هاندانی لایەنی دوژمنانی دەرەکی بێ، دێن دنەی ئەو دیالێکتانە دەدەن، ئێستا باسی (زمانی هەورامی) هاتۆتە گۆڕێ باسی دیالێکتی کوردستانی باکوور هاتۆتە گۆڕێ، ئەوانە ئێستا بەڕاستی گرفتێکن، لە بەردەم زمانی یەککگرتووی کوردیدا، ئێمە کاتێک دەتوانین بلّێین ئەوانە زمانن کە نەتەوەیەکی جیاوازبن ئێمە هەموان پێکەوە نەتەوەیەکین، چ بە هەورامی چ بە دیالێکتەکانی دیکە، چ بە زاراوەی کرمانجی سەروو، هەموو ئەمانە دەتوانن زمانێکی تۆکمە و یەککگرتووی ئەدەبی نەتەوەیی پێک بێنن، جەنابت ئەمە چۆن دەبینی، پێت وایە دەبێ چ بکرێت تاکوو ئەو دیالێکتانە نەبنە لەمپەرێک لە بەردەم زمانی یەککگرتوودا چۆن دەبێ هاندەر بن بۆ یەککگرتنی ئەو زمانە؟**

- حەزدەکەم ئەوە بلّێم کە مەسەلەی بەکارهێنانی شێوە زمانی کوردیی باکوور یان تەنانەت بادینانیش لە نووسیندا بە هیچ شێوەیەک ناکرێت وەکوو هاندانی بیانی یان شتێکی لەو جۆرە تەماشا بکرێت. شێوە زمانی کوردیی باکوور لە چەند دیالێکتێک پێک هاتووە: بادینانی، بایەزیدی، بۆتانی...تاد. خەلّکی باکووری کوردستان بەهۆی ئەو هەلومەرجە سیاسییەی کە تێکەوتوون، لە باشوور و ناوەڕاستی کوردستان دابڕاون. ڕاستییەکەی بادینانیش سالّانێکی یەکجار زۆر دەولّەتی عێراق، وەک بەشێک لە ستراتیجیای شۆڤێنیی خۆی، لە باشووری کوردستانی دابڕیبوو، خوێندن لە کۆتایی بیستەکان و

سەرەتای سییەکانەوە لە باشووری کوردستان لە سلێمانیو هەولێر هەندێ ناوچەی کەرکووک بە کوردی بووە، بەڵام قەت دەوڵەتی عێراق ڕێگەی نەداوە خەڵکی بادینان بە کوردی بخوێنن، بەڵکو ناچاری کردوون بە عەرەبی بخوێنن، لەبەرئەوە دابڕاون لە ناوچەکانی تر: سەرەنجام دیالێکتەکەیان، لەوانە بادینانی، بە شێوەیەکی تایبەت و سەربەخۆ لە پەیڤیندا گەشەیان کردووە. لە حەفتاکان بە دواوە بە بادینانی دەنووسرێت، ئەمە بەشێکە لە گرفتی زمانی کوردی یان گرفتی سیاسیی نەتەوەی ئێمە، بەڵام قسەکە ئەوەیە ئاخۆ لە باشووری کوردستاندا دەکرێ ئەمڕۆ دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و ستاندارت هەبێ و حکوومەت و پەرلەمان و هەموو شتێک بە دوو زمان بنووسن و بڵاوبکەنەوە؟ قسەکە لەوە دایە، دەنا ئینسان ئازادە بە چ شێوە زمانێک، بە چ زاراوەیەک، دیالێکتێک، دەنووسی، گۆرانی دەڵێ، فیلم ساز دەکا، شانۆنامە پێشکەش دەکات هتد... بەڵام لە باکووری کوردستاندا کەی زمانەکەیان و خۆیان ئازاد بوون، ئەوکاتە ئەوان، لە هەر کەسێک باشتر دەزانن چ شێوە زارێک، وەک بناغەی زمانەکەیان، هەڵدەبژێرن، دیالێکتی هەکاری، بایەزیدی، دیاربەکری، یان بادینانی هەڵدەبژێرن، یان ئەو شێوە زمانە هەڵدەبژێرن کە ئێستا لە دەرەوەی کوردستان لە ئەورووپا پێ دەنووسرێت و لەو زمانە ئەدەبییە جیاوازە کە مەلای جەزیری و خانی پێیان نووسیوە. بەڵام زاراوەی هەورامانی شتێکی ترە، زاراوەی هەورامانی یان گۆران لە سییەکانەوە کە خوێندن چۆتە ناوچەی هەورامان، مندالان بەو شێوە زمانە خوێندوویانە. ئەمڕۆ دەیان نووسەری گرنگ هەن، کە لە ئەسڵدا ئاخاوتنیان بە شێوەی زاراوەی هەورامییە. بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دەنووسن و ژیانی ئەدەبیی ئێمەیان دەوڵەمەند کردووە. ئەو داوایەی کە ئێستا کراوە، داوایەکی سیاسییە. داواکە لە ناوەڕۆکدا ئەوەیە کە دەڵێ خەڵکی

هەورامان کورد نین و هەورامانی کوردی نییە، ئەمە جێگەی گومانە، ئاخۆ لە هیچ وڵاتێکی دنیا زاراوە بە تەنیا بوتە ئەساسی ئێتنیسیتی؟ ئاخۆ خەڵکی هەورامان گروپێکی ئێتنیکی تایبەتن؟ ئەگەر تایبەتن چی لە کورد جیایان دەکاتەوە؟ ئاینیان، مەزهەبیان، رابردووی مێژووییان، زمانەکەیان؟ دیالێکت بە تەنیا ناتوانێ ئەساسی ئێتنیکی پێک بێنێ، لەبەرئەوە داواکە، داوایەکی سیاسییە و زۆر کەس پێی وایە کە ئەمە دەستێکی لە پشتەوەیە.

*** دوکتور هەروەک دەبینین ئێستا رایەکی جیاواز هەیە لە ناو ئەدیبان و روشنبیراندا، کە زۆریش زەقە، دەیانەوێ ئەلفوبێی لاتینی بەکار بێنن مەسەلەکە زۆر لەوە بەربڵاوترە کە دەیانەوێ جێگای ئەو ئەلفوبێیە ئارامییەی کە دووسەد ساڵ زیاترە کورد پێی دەنووسێت و لە مێژوو و کولتوور و هەموو هزری ئەو نەتەوەیە جێی گرتووە. بە رای جەنابت بەکارهێنانی دوو شێوە نووسین، دوو ئەلفوبێ لەناو زماندا چ گرفتێک بۆ ئەو زمانە درووست دەکا؟**

- بە رای من یەکێک لە گرنگترین گرفتەکانی زمانی کوردی ئەوەیە کە ئێمە بە دوو شێوە ئەلفوبێ، ئەلفوبێی کوردیو ئەلفوبێی لاتینی تورکی دەنووسین. ئەمەش دیاردەیەکی نوێیە، لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی رابردوودا، دوای دامەزرانی دەوڵەتی ناسیۆناڵی تورک، دەرکەوتووە. تورکەکان و ناسیۆنالیزمی تورک بەسەر کورددا سەپاندیان، ئەوان هاتن لەناو چوارچێوەی تورکیادا یەک زمانی رەسمییان سەپاند، زمانی تورکی، هەموو زمانەکانی دیکەیان یاساخ کرد و هەوڵی کوشتنیان دا. لە هەمان کاتدا ئەلفوبێی کۆنی عوسمانی- ن عەرەبییان گۆڕی بە ئەلفوبێی لاتینی. لێرەوە ئەو گرفتە لە رێی ئەوانەوە هاتە ناو نووسینی کوردی. ئەمە بۆ خۆی دیوارێکی گەورەی لە نێوان کوردی باکوور و کوردی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا

درووست کردووه، رەنگە بە لاتەوە سەیر بێت کە بڵێم لەهەموو رووناکبیرانو نووسەرانی باکووری کودستان دە کەس نادۆزیتەوە کە بتوانێ بە ئەلفوبێی کوردی بخوێنێتەوە. بۆیە ئەوان نازانن چ سامانێکی ئەدەبیو کولتووری و فکری بەو شێوە زمانە نووسراوە، کە شایانی ئەوەیە فێری ئەو ئەلفوبێیە کوردییە بن. ئەلفوبێ روخساری زمانە و پێناسەی زمانێک و کولتوورێک، یان سیما و روخساری کولتوورێک و زمانێک پێشان دەدا.

هەر نەتەوەیەک لە دنیادا کە هاتبێت دەستی بە نووسین کردبێت، یان زمانەکەی لە زمانی قسەکردنەوە گۆڕدرابێ بە زمانی نووسین، ئەلفوبێی تایبەت بە خۆی هەڵبژاردووە، بۆ نموونە لە ئەورووپا زمانی لاتین زاڵ بوو. لە رۆژئاوای ئەورووپا هەموو زانست و خوێندەواری و رووناکبیری، تا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم بە زمانی لاتینی بوو. کاتێک بزاڤی ناسیۆنالیسی لەو وڵاتانە دەرکەوتن و خۆیان وەک نوێنەری نەتەوەیەکی سەربەخۆ ناساند، دەستیان کرد بە نووسین بە زمانی خۆیان. لە ئەنجامدا زمانی لاتینی لهو وڵاتانەدا پاشەکشەی کرد و نەما. بەڵام ئەلفوبێی لاتینی بە میرات مایەوە و هەر نەتەوەیەک لەگەڵ سیستمی دەنگی و تایبەتمەندیی زمانی خۆیاندا گونجاندیان، لەوێوە. بۆ نموونە ئەلفوبێی سوێدی پەیدا بوو کە کۆمەڵێک دەنگ و وێنەی تێدایە لە لاتینیدا نەبووە، ئەلفوبێی ئاڵمانی، فرانسایی‌تاد.. بە هەمان شێوە دەرکەوتن. لەو رۆژەوە کە کورد زمانەکەی بۆتە زمانی نووسین، لە سەردەمی مەلای جەزیرییەوە، نزیکەی پێنج سەدەیەک پێش ئێستا ئەو ئەلفوبێیەی هەڵبژاردووە، لەبەرئەوەی ئەو کاتە کولتوور و زمانی عەرەبی و فارسی لە کوردستاندا زاڵ بوون، خوێندن و خوێندەواری، زانست بەو دوو زمانە بوو، ئەدەبییات بەو دوو زمانە بوو. کەواتە ئەم ئەلفوبێیە، لە کوردستاندا، لە پرۆسێسی

دروستبوونی زمانی ئەدەبیی کوردیدا دەرکەوتووە و سەرجەم هزرو بیرکردنەوە و تێڕوانین و سیستمی بیرکردنەوەی ئینسانی کورد، لە ماوەی نزیکەی پێنج سەدەیەکدا بەم ئەلفوبێیە نووسراوە. ئەلفوبێی کوردی بە جۆرێکی جوان و سەرنجڕاکێش، کە دینامیکیی زمانی کوردی دەردەخات، هەموار کراوە و گەشەی پێدراوە. بۆ نموونە کۆمەڵێک، پیت لە ئەلفوبێی کوردیدا کە عەرەبی تۆخن دەرهاوێژراون، بۆ نموونە (ص- ض- ط- ث-ظ) چونکە لە کوردیدا بەکارنایەن، لە بەرامبەر ئەوەدا کۆمەڵە دەنگێکی تر کە تایبەتن بە زمانی کوردی وێنە (حەرف)یان بۆ دانراوە، لەوانە( بزوێنی ـە- ڵ- گ- پ- چ- ژ- ڤ ...تاد) بەڵام ئەلفوبێی لاتینی-تورکی لە باکووری کوردستان، بە پێچەوانە بووە. چونکە لە رەوشی گەشەکردنی کولتووری کورددا لە باکوور دەرنەکەوتووە، بەڵکو لە دەرەوەڕا بە شەق و زۆرداری سەپێندراوە، بۆیە گەرووی ئینسانی کوردی باکوور تێکدراوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەلفوبێیە تورکی- لاتینیەکەدا بگونجێ، کوردی باکوور ناتوانێ بڵێ (مەحەمەد، عەلی) کۆمەڵێ دەنگی وەک (ح،ع،غ،ق...تاد) هەیە کە گەرووی مرۆڤی کورد هەزار ساڵ زیاترە پێی راهاتووە، تورک ئەمانەی دەرهێناوە لە زمانەکەیان، کە تورک بەکاری ناهێنێ کوردی باکووریش لە کوردییەکەدا دەریان هێناوە، کەچی لە زمانی کوردیدا هەزار وشە هەن، کە ئەو حەرفانەیان تێدایە و کوردی باکوور ناتوانن بە دروستی ئەو وشانە بڵێن و بنووسن!!.

*** دوکتور ئێستا ئەوانەی کە لایەنگری ئەو ئەلفوبێ لاتینیەن بەڵگەی سەرەکییان ئەوەیە، دەڵێن ئەو شێوە روخسارە، نووسین واتە نووسین بەو شێوەیە بە ئەلفوبێی لاتینی، بەرەو پرۆسەی بە جیهانی بوون نزیکت دەکاتەوە بە زمانی ئینگلیزییەوە، جەنابت ئەوە چۆن دەبینی؟**

- ئەلفوبێ بە تەنیا نەیتوانیوەو ناشتوانێ نەتەوەیەک لە شارستانی دنیا و لە جیهانگیری نزیکتر بکاتەوە. ئەگەر وا بوایە ژاپۆنییەکان یەکەمین کەس بوون وازیان لە هەیرۆگلیفی خۆیان دەهێنا و ئەلفوبێی لاتینیان بەکار دەهێنا، ئەمڕۆ هیچ گوندێکی ئەم دنیایە نییە، ئوتۆمبیلی ژاپۆنی تێدا نەبێ یان تەلەفیزیۆنێک، ڤیدیۆیەک، شتێکی تەکنیکی، کۆمپیوتەرێکی ژاپۆنی تێدا نەبێ، هیچ نەتەوەیەکی دنیا رەنگە دوای رۆژئاوای ئەورووپاو ئەمریکا، هێندەی ژاپۆن تێکەڵی جیهانگیری نەبووبێت و جێگەی خۆی لە هەموو شوێنێکی ئەم دنیایە نەکردبێتەوە، چینییەکانیش بە هەمان شێوە. بۆیە ئەگەر ئەلفوبێ یارمەتیدەر بوایە، ئێستا دەبوایە تورکیا لە جیاتی ژاپۆن و چین و کۆریای باشوور لە بەجیهانیبوون نزیکتر بوونایە. لەبەر ئەوە ئەلفوبێ کەم و زۆر دوور و نزیک پەیوەندی بەو مەسەلەیەوە نییە، نەتەوەیەک لە رێی توانای زانستی، توانای تەکنیکی، توانای ئابووری و دواتر سیاسییەوە، دەتوانێ شوێنی خۆی لە دنیادا بکاتەوە، نەک لە رێگەی ئەلفوبێیەکەیەوە، ئەلفوبێ هیچ پەیوەندییەکی بەو مەسەلەیەوە نییە.

*** دوکتور هەروەک نەتەوەکانی رۆژهەلات، تورکو عەرەبو فارسو کورد بە هۆی ئەو تێکەلاوییە ئەو کولتوورەی کە هەیان بووە، بەهۆی ئەو سنوورە هاوبەشە جوگرافیایە کە هەیان بووە زۆر زمانەکەیان لەسەر یەکتر کاریگەری هەبووە، ئێستا دەبینین زمانی عەرەبی پێشینەیەکی زۆری هەیە، لەباری مێژووییەوە کاریگەرییەکی ئێجگار زۆری لەسەر زمانی فارسی داناوە رایەکی ئێجگار زۆر هەیە لەناو فارسەکاندا ئەگەر زمانی فارسی ئەو عەرەبییانەی لێ دەرهاوێی بەشی قسەکردنی نامێنێ، ئێستا بەلام ئەوەندە دەتوانین بلێین زیاتر لە سیی ملیۆن کەس، بە زمانی فارسی دەنووسێ بێگومان ئێستا ئەو**

**زمانە (فارسی) و ئەو شتانە بە ملکی خۆی دەزانێ، بەکارهێنانی وشەی بێگانە لەناو زماندا چۆن دەبینی، ئاخۆ هاتنی وشەی بێگانە لەناو زماندا زەربە لە زمان دەدات؟ ئێمە لە مێژوودا دیومانە دیالێکت یان زاراوەی هەورامان بەهۆی داخراویی جوگرافیایی کە هەیبووە زەربەی لە زاراوەکە داوە و نەیتوانیوە پەرە بستێنێ، رایەکی جیاواز ئێستاش هەر هەیە دەڵێ هەورامان لەباری بەرهەمهێنانەوە سەربەخۆن‌و لەباری ئابووری لە باری ئەو شتە کولتووریانەوە، بەڵام دەبینین ئەمە لە درێژخایەندا زەربە لە زمان دەدات، پاراستنی زمان ئاخۆ ئەکرێ بێت و تەنیا کولتوورەکەت بپارێزی کە کەس دەستی لێ نەدا، یان نووسین هۆی بەربلاوکردنی ئەو زمانە یان بەکارهێنانی، رامان و تێفکرین، نووسینە- زانستە، فیلمە، ئەمانەیە جەنابت بەکارهێنانی وشەی بێگانە چۆن دەبینی؟**

- راستییەکەی جارانیش و ئێستاش، هیچ کولتوور و نەتەوەیەک نەبووە، لەناو قەڵایەکی داخراودابێ و دوور بێ لە کاریگەری‌و کارتێکردنی کولتوور و زمانی خەڵکی تر. لەبەرئەوە زمانەکان کار لە یەکتر دەکەن، ئەو زمانەی زۆرتر بەرهەمی ئەدەبی و فیکری و زانستی پێ نووسراوە، زیاتر دەرفەتی گەشەکردن و کارتیکرنی بووە. زمانەکان بە شێوەیەکی سروشتی‌و ئاسایی لە رێگەی ئەو زانین و زانیاری و بەرهەمە ئەدەبییانەی کە هێناویانەتە بەرهەم، کاریگەریی خۆیان لەسەر یەکتری دادەنێن. لەبەرئەوە شتێکی زۆر سروشتییە کە ئێمە لە زمانانی ترەوە وشە بخوازین، پێشتریش خواستوومانە. هیچ زمانێکی ئەدەبی نییە کە هەزاران وشەی بێگانەی تێدا نەبێ، بۆ نموونە بولگاری، رووسی، سوێدی....تاد ئەمە شتێکی زۆر سروشتیە، ئەو بە پەتییکردنەی لای ئێمە هەندێ جار لە رووی زانستیەوە دروست نەبووە و نەزانانە کراوە و زیانی زۆری بە زمانی کوردی گەیاندووە. جاری وایە بیست لاپەرە بە کوردی دەخوێنیتەوە یەک

وشەی عەرەبیت تووش نابێت، لەکاتێکدا هەندێ وشەو چەمکی عەرەبی هەیە، لە بواری فیکر و ئەدەب و فەلسەفە و سۆفیگەریدا، کە لە سەردەمی مەلای جزیری و خانییەوە هاتوونەتە ناو ئەدەبیاتی کوردی و بوون بە بەشێک لە زمانی کوردی. کەچی لابراون و لە جیاتیان بە کوردی، وشەی ناقۆلا و سەقەت داتاشراون. هەر وشەیەک، ریشەکەی لە هەر کوێوە بێت، ئەگەر خەڵکی ئاسایی، ژنێکی ماڵ و مامۆستایەک تێیگەیشت و لە کاتی پێویستدا توانی بە کاری هێنا، ئیتر ئەمە بۆتە کوردی و کوردییە. تۆ باسی زمانی فارسیت کرد، من کە وەختم هەبێت بە فارسی دەخوێنمەوە، زۆر زەحمەتە یەک رستەی فارسی، لە نووسینێکدا، بدۆزێتەوە کە وشەیەکی عەرەبی تێدا نەبێت. تێکستێکی فارسی ئەگەر شەست دێڕ بێت، شەست وشەی عەرەبی کەمتری تێدا کەچی لای ئێمە جۆرە حەساسییەتێک بەرامبەر وشەی عەرەبی دروست بووە، کە بە بۆچوونی من لە هەندێ رووەوە زیانی پێ گەیاندووین. ئێمە دەبێ باوەڕمان بە زمانی خۆمان بێت، باوەڕمان بە خۆمان هەبێت، وشەیەک کە لەگەڵ زمانەکەمان و سیستمە دەنگییەکەی دەگونجێت و مانای خۆی دەگەیەنێ و لە کوردیدا نیمانە، دەبێت بەجورئەتەوە وەریبگرین و بەکاری بهێنین. هەندێ زمان هەیە بۆ نموونە: زمانی فنلاندی، زمانی عەرەبی، لەو زمانانەن کە زۆر بە زەحمەت، وشەی تر کە لە زمانێکی ترەوە بێت تێیاندا جێگەی دەبێتەوە، چونکە لەگەڵ سیستمی زمانەکەدا ناگونجێ، بۆیە دەبێ لە زمانەکەیاندا بەرامبەرەکەی بدۆزنەوە، یان دایبتاشن. ئێمە ئەم گرفتەمان نییە سروشتی زمانی کوردی یارمەتیمان دەدات کە وشە لە زمانانی هیند ۆ ئەوروپایی و عەرەبیشەوە وەربگرین و بەکاریان بهێنین.

*** دکتور هەروەک باستکرد ئێستا زۆر وشەی عەرەبی هەیە هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە بەتایبەت نێوی تاکەکان، کەسەکان، عەبدوڵا،عەلی، ئەوەی کە (ئەڵلای) پێوەیە ئەمن پێم وایە پیتی (ع) لە نێو زمانی کوردیدا زۆر کەمە ئەو وشانەی کە (ع) تێدابێت لە لاوە هاتوونەتە نێو زمانی کوردی و هەمووی عەرەبین بەڵام ئێستا تۆ ناتوانی بڵێی کوردی نین‌و ناتوانی بە کاریشی نەیەنی، بۆیە پێویستە و دەبێ بۆ پەرەپێدانی زمانەکەشت وشەی بێگانەش بەکار بێنێت کاری پێ بکەیت، تاکوو بتوانی لە رێگەی ئەوەوە لەگەڵ کولتووری نەتەوەکانی دیکەشدا، پەیوەندییەکی پتەوت هەبێ، ئێستا رایەکی تر هەیە کە دەڵێ زمانی کوردی لەباری دەقی تیۆری و وشەی زانستیەوە کەم دێنێت، کاتێک تۆ دێیت باسێکی زانستی دەکەی بەراستی لەو بوارەدا کەم دێنیت تۆ ئەمە چۆن دەبینی، ئەم کەموکورییە لە زمانی کوردیدا هۆکارەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە، دەبێ چ بکەین ئاخۆ بێین ئێمە زاراوەی نوێ بتاشین، ئەو زاراوە نوێیانە دەبێ بەپێی پێوەرەکانی زمانناسی و زانستی زمان بن، رای جەنابت لەسەر ئەمە چییە؟**

- راستییەکەی زۆربەی وڵاتان و نەتەوەکان، بە تایبەتی لە رۆژهەڵات، بە شێوەیەک لە شێوەکان، گرفتی لەم جۆرەیان هەیە، هەرچەند بۆ نموونە ئەگەر ئێمە عەرەب و فارس باس بکەین، عەرەبی‌و فارسی بەلای کەمەوە، هەزار ساڵ زیاترە کە فەلسەفەی پێ نووسراوە یان وەرگێڕانی پێ کراوە، لە بواری لۆجیک ، لە بواری ماتماتیک لە بواری کیمیا لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئێستا، بەشی خۆیان، گرفتی جیددیان لەو بوارەدا هەیە، هۆیەکەشی ئەوەیە زانین زانس سنووریان بۆ نییە و دەرکەوتنی زانست و زانیاریی نوێش بێسنوورە و رۆژانە دەشێت چەندان تێرم و وشەی نوێ بێتە ناوەوە ،کە نەک هەر ئێمە بەڵکو زۆربەی گەلانی دیکەش نییانە، لەبەرئەوە لە

چوارچێوە گشتیەکەیدا ئەمەگرفتێکی جدییە بۆ ئێمەی کورد. نووسین لە بواری فەلسەفە، کۆمەڵناسی، دەروونناسی، فەلەکناسی، پزیشکی..تاد بۆ ئێمە تازەن و زۆربەی خەڵکی ئێمە لێرە ئەم زانستانە بە عەرەبی دەخوێننەوە. لە رۆژهەلاتی کوردستان بە فارسی، یان لە باکوور بە تورکی. هەرچەند فارسەکان زۆر زاراوە و دەستەواژەی نوێ لە ئەورووپاوە دێنن، بۆ کۆنەکانیش سوودیان لە زمانی عەرەبی وەرگرتووە. لەبەرئەوە ئێمە ئەو گرفتەشمان بۆ زیاد بووە، بەڵام هیچ زمانێک نییە خۆی لە خۆیدا توانای ئەوەی تێدا نەبێت، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو زانستانەی پێ بنووسرێت. سەرەتا ئەو وشەو تێرمانە کە یەکەمجار دەبیسترێن سەیر و نامۆ دێنە بەرچاو، بەڵام دواتر لە رێگای بەکارهێنانییانەوە لە نووسیندا، لەناو زمان و کولتوورکەدا و لەناو ئاگایی ئێمەدا جێگەی خۆیان دەکەنەوە و دەچەسپێن. بەشێکی تری ئەم گرفتە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئێمە بە تەواوی زمانی خۆمان نازانین، وەک پێویست ناتوانین توانای داهێنەرانەی زمانەکەمان ئاشکرا بکەین. ئێمە لە منداڵییەوە، بۆ نموونە دەڵێم فەلسەفە و سۆسیۆلۆجیامان بە کوردی نەخوێندووە، زانستی ترمان بە کوردی نەخوێندووە، یان نەریتێکی مێژوویی دەیان و چەندسەد ساڵەمان، لە بواری نووسینی ئەو بابەتانە بە کوردی نییە. بۆیە ئێمە توانامان زۆر نییە یان کەمە، تا لەم بارەیەوە زمانەکەمان بە باشی و وەک پێویست بەکار بێنین.

*** دوکتور هەروەک باسمان کرد، زمان یەکێک لەو پێوەرانە بوو کە هەر نەتەوەیەک دەتوانێ بۆ بوونی خۆی هەیبێ، واتە بۆ سەلماندنی خۆی زمانی ستاندارد چ رۆڵێک دەبینێ لە دروستبوونی نەتەوەدا. هەروەک دەبینین لە رۆژئاوا زۆر نەتەوە هەن نەتەوەن و وڵاتی سەربەخۆیان هەیە بەڵام زمانێکی دیکە بەکاردێنن، جیاوازی**

**ئەوانە لەگەڵ کورددا چییە؟ زۆر وڵاتی دیکەش هەیە کە لە چەندین نەتەوە پێکهاتوون، بەڵام یەک زمان بەکاردێنن، جیاوازی ئەوانە لەگەڵ کورددا چییە لەباری پێکهاتنی ئەو نەتەوانەوە ؟ فاکتەرگەلێکی بوون و گرنگ هەن و کورد ؟ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوانەدا هەیە؟**

- ئاشکرایە هەر نەتەوەیەک بۆ ئەوەی یەکەیەکی ئێتنیکی نەتەوەیی سەربەخۆ بێت، دەبێ کۆمەڵێک تایبەتمەندی خۆی هەبێت کە لە نەتەوەکانی دیکەی جیا بکاتەوە، ئەم تایبەتمەندیانە بە زۆری و لە بنەڕەتدا کولتوورین، هەندێجار تایبەتمەندیی سیاسی، دۆخی سیاسی و مێژوویی دێتە گۆڕێ، هەندێ جاریش فاکتەری بایۆلۆجی، ڕەنگی پێست بۆ نموونە یان فۆرمی دەموچاو. بەڵام یەکێک لەو فاکتەرە گرنگانەی کە نەتەوەیەک خۆی، لە نەتەوەیەکی تر جیادەکاتەوە زمانە. هەرچەندە، لە هەندێک حاڵەتدا، زمان پێناسە (هەویە-شوناس)ی نەتەوە دیاری ناکات. بۆ نموونە گەلانی ئەمریکای لاتین بە ئیسپانی قسەدەکەن، کەچی خۆیان بە ئیسپانی نازانن. گەلی شیلی خۆی بە شیلی دەزانێ، کووبایی خۆی بە کووبایی دەزانێ، یان خود هەندێ گەلانی ئەفریقا، کە کاتی خۆی لە لایەن بریتانیاوە کۆلۆنیال کرابوون، زمانی دایکیان ئێستا بۆتە ئینگلیزی و ئینگلیززمانن، بەڵام ئینگلیز نین، هێندێکی دیکەیان کە لە ژێر دەستی فەرانسادا بوون زمانیان بۆتە فرەنسایی. کەواتە لێرەدا ئەوەی کە گرنگە کام توخمی کولتووری، کام لایەنی کولتووری یان کام فاکتەری بایۆلۆجی، سیاسی بنەمای ئەساسی پێکهاتنی نەتەوەیی پێک دێنێت؟ لە حاڵەتی ئێمەی کورددا، زمان تاکە فاکتەرێکی ئەساسییە، یان تاکە فاکتەرە کە ئێمە لە تورک و عەرەب و فارس جیا دەکاتەوە. ئێمە /سەدان ساڵ و تاکوو ئێستاش ژێردەستی ئەو نەتەوانە بووین، کولتوور و زمانی ئەوان بە هەموو شێوەیەک، لەرێگای دەسەڵاتەوە، لەرێگای پەلاماری عەسکەرییەوە، لە رێگای فەرهەنگەوە، لە رێگای

راگەیاندن و سیستمی خوێندنەوە، بەسەر ئێمەدا سەپێنراوە. ئەگەر زمانەکەمان لەبیر چووبایەتەوە، فاکتەرێکی دیکە نەبوو لە وانمان جیابکاتەوە، ئاییمان هەمان ئایینە، مەزهەب، هەر هەمان مەزهەبە، رەنگی پێست و دەموچاو و شێوە هەمان شتن. من لە قەفقاز ژیاوم، لە ئەفغانستان و ئێران و سوریا و بولگارستان ژیاوم، لە هیچکام لەو وڵاتانەدا، ئەگەر قسەم نەکردبێت و تەنیا دوای ماوەیەک قسەکردن، هەستیان کردووە بیانیم، دەنا کەس نەیزانیوە من خەڵکی ئەو وڵاتە نیم، لەبەرئەوە ئێمە لە رووی روخسار و شێوەوە لەگەڵ گەلانی ناوچەکە لەیەک دەچین، لە رووی ئایین و مەزهەبیشەوە هەمان شتین بۆ نموونە: لە ئایرلەند فاکتەری مەزهەب لە بنەڕەتدا گەلی ئایرلەندی کردۆتە دوو نەتەوە و دوو گەلی جیاواز، یۆگوسلاڤیا باشترین نموونەیە، یۆگوسلاڤیا تاکوو ساڵی ١٩٩١ یەک زمانی ستاندارد و رەسمییان هەبوو، کە بە زمانی سێربۆکەروات (سێرب و کەروات) ناسرا بوو. بەڵام کاتێک یۆگوسلاڤیا هەڵوەشایەوە، فاکتەری مەزهەبی و هەندێ گرفتی مێژوویی نێوان سێرب و کەرواتەکان، (سێربەکان ئەرسەدۆکسن و کەرواتەکان کاتۆلیکن) بوو بە بنەمای پێناسەی ئێتنیکی یان شوناسی نەتەوەییان. کاتێ ئەوان لێک جیابوونەوە زمانەکەشیان ئۆتۆماتیکی بوو بە دوو زمان. بەڵام لە حاڵەتی وڵاتانی کۆلۆنیالکراودا، لە ئەفریقاداو هەندێ وڵاتی تردا، فاکتەری بایۆلۆجیو جیۆگرافی رۆڵی بنەڕتییان هەبوو. کەسێکی رەشپێستی ئەفریقایی، بۆنموونە خەڵکی باشووری ئەفریقا، کە ئینگلیزی بۆتە زمانی زگماکی، ناتوانێ ئینگلیز یان بریتانی بێت، بێجگە لەوەی کە بە هەزاران کیلۆمتر وڵاتەکەی لەوێ دوورە، رەنگی پێست و دەموچاویشی، بێجگە لە فاکتەری تری مێژووییو کولتووری، تایبەتمەندیی خۆیان پێداوە. بەڵام بۆ ئێمە زمان تاکە بنەمای سەرەکیی کوردبوونە بە مانا ئێتنیکیەکەی، نەک کورد بوون

بە مانا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی.

*** دوکتور هەروەک باست کرد زمان یەکێک لە سەرەکییترین پێوەرەکانە بۆ بوون بە نەتەوە، بەڵام ئێمەی کورد بە هۆی ئەو هەلومەرجە سیاسییەی کە کوردستان لێک دابڕاوە، زاراوەی کرمانجی سەروو لەگەڵ کەلهوڕو هەورامی و زاراوەی سنەیی کە ئەردەڵانە، ئەمانە ئێستا زۆر گرفتیان بۆ زمانی کوردی سازکردووە لێک تێنەگەیشتن تەنانەت لەنێوان تاکەکانیشدا گرفت هەیە جەنابت جیاوازی نێوان زمانو دیالێکت لە چیدا دەبینی؟**

- هەر زمانێک لە کۆمەڵێک دیالێکت پێکهاتووە، لە هەندێ زماندا جیاوازی نێوان دیالێکتەکان زۆر نییە، بەڵام لە زۆربەی زمانەکاندا چەند دیالێکتێک یان زیاتر لە دیالێکتێک بە رەوشێکی تۆزێ جیاوازتردا رۆیشتوون و لە زمانەکە دوورکەوتۆنەتە بۆیە خەڵک بە ئاسانی تێیان ناگەن. زمان و دیالێکت لە رووی زانستی زمانەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە. هەر دیالێکتێک ئەگەر پێی بنووسرێت، قاموسی بۆ دابنرێ، رێزمانەکەی دیاری بکرێ، دەکرێ بەرەو زمان بڕواتو ببێتە زمان بەڵام مەرج نییە زمانێکی پڕ بەرهەم بێت، دەشێ زمانێکی نەزۆک بێ و لەبواری ئەدەب، فکر، فەلسەفە، زانین و زانستدا، کەمترین شتی پێ بهێنرێتە بەرهەم. بەڵام بە گشتی فاکتەری سیاسی، یان ئاینی و مەزهەبی دیالێکتێک دەگۆڕێت بە زمان. هیچ دیالێکتێک، هەر لەبەرئەوەی جیاوازە و خەڵکی دی تێی ناگات، مانای ئەوە نییە کە دەبێ ببێتە زمانێک لە پاڵ زمانی ستانداردا، بۆ نموونە: سوێد نزیکەی ٦٠٠ ساڵێکە زانکۆی هەیە، سەدان ساڵیشە پەرلەمان و زمانی ئەدەبیی خۆی هەیە. کەچی هەتا ئێستا، لە ناوچەی ((دالەرنە)) هەندێ شوێن هەیە، کە خەڵکەکە بە زاراوەیەک دەدوێن، کە سوێدییە بەڵام سوێدییەکان تەنانەت لە رستەیەکیشی تێناگەن. بەڵام ئەمە

نەبۆتە بەهانەی ئەوەی کە ئەو دیالێکتە ببێتە زمانێکی جیاواز. زمانی ستاندارد، خۆی کە لە ڕێگەی خوێندن و سیستمی خوێندنو ڕاگەیاندنو دەزگاکانی ترەوە دەبێتە زمانی هاوبەشی نێوان هەمووان. نموونەیەکی تر چینە، دانیشتوانی چین یەک ملیارد زیاترە، لە چیندا دەیان دیالێکت هەیە، کە زۆر لە یەکتری جیاوازن. بەڵام چین یەک زمانی هەیە کە زمانی ستاندارد و ڕەسمییە. ئەو زمانە بۆتە زمانی هاوبەش و تاکە زمانی ڕەسمی و ستانداردی چینی، کە هەموو چینییەکان لە ڕێگای ئەو زمانەوە دەتوانن پەیوەندی لەگەڵ یەکتر بکەن و کاری ڕۆژانەی خۆیان، لەگەڵ یەکتری، جێبەجێ بکەن. بەڵام لەوەش زیاتر خەڵکی تایوان بە زاراوەیەکی تایبەت دەدوێن، کە زۆر لە زمانی ستانداردی چینی جیاوازە، ئەوە شەست ساڵ زیاترە تایوان لە چین جیابۆتەوە، کەچی هەمان زمانی ستانداردی چینی بەکاردێنن. چونکە زمانی چینی بێجگە لەوەی کە سامانێکی مەزنی کولتووری پێ نووسراوە، لە هەمان کاتیشدا فاکتەرێکە بۆ ئەوەی بتواندرێ ئەندامانی نەتەوە پێکەوە کۆ ببنەوە و لێک تێبگەن. زمانی ستانداردیش موڵکی هیچ زاراوە و هیچ ناوچەیەک نییە، ئینسان دەبێ زۆر ناوچەپەروەرو بەرچاوتەنگ بێت، یان شۆڤێنیزمی زاراوەیی و ناوچەیی توانای بیرکردنەوەی لێ بڕیبێت، کە زمانی ستانداردی نەتەوە بە زمانی ناوچەیەک بزانێ. زمانی ستاندارد زمانی نەتەوەیە، سمبولی نەتەوەیە، کەسایەتی و پێناسەی نەتەوەکە دەردەخات. شێوە و ئاستی بیرکردنەوەی، ئاستی کولتوور و شارستانەیی نەتەوەکە لە ڕێگای زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەکەیەوە، یان زمانە ستانداردەکەوە، دەردەکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی کە بە دیالێکتێک دەدوێن ئەگەر حەز بکەن هیچ کەسێک ڕێگەی لێ نەگرتوون خۆ کوردستان نەبۆتە تورکیا تا زمان و زاراوە کوشتنی تێدا بێت، هەر کەس ئازادە بە شێوە زمانەکەی خۆی دەتوانێ بنووسێ، ڕۆمان بنووسێ، چیرۆک،

شیعر بنووسێ، چی دەنووسێ، بنووسێ بەڵام زاراوە لە هیچ شوێنێک ناتوانێت ببێتە جێگرەوە، یان ئاڵترناتیڤی زمانی ستاندارد.

*** دوکتۆر بێگومان زۆر هۆکار هەن لە دروستبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا کاریگەری بەسوودیان هەیەو لە هەمان حاڵیشدا ئەگەر خراپ بەکاری بێنێ زیانێکی خەسار هەڵگری هەیە بۆ زمان و کولتووری ئەو نەتەوەیە، یەک لەو ئامرازانە وەرگێڕانە، ئەمڕۆ لە کوردستاندا چەندین ناوەند دانراون بۆ ئەو مەبەستە کار دەکەن. وەرگێڕان ئامرازێکی گرنگە بۆ لێک تێگەیشتنی کولتووری نەتەوەکان و زۆر دیاردەی ئەو کولتوورانە دێنە ناو زمان و کولتووری نەتەوەکەتەوە، بەڵام لە کوردستاندا ئێمە دەبینین دەقی زۆر ناپوخت دێتە ناو زمان و ئەدەبی کوردییەوە، بە رای جەنابت هۆکارەکەی بۆچی دەگەڕێتەوە، ئاخۆ نەبوونی ناوەندێکی بڕیاردەری زانستی وەرگێڕانە یا هۆکارێکی دیکە، بە گشتی ئەو شەپۆلە وەرگێڕانە چۆن دەبینی کاریگەری لەسەر زمانی کوردی چییە؟**

- ئێمە بە داخەوە ئێستا نە لە بواری ئابووری و نە لە بواری زانستی، نەلە بواری کولتووری بە گشتی، پلانی دارێژراومان نییە، کە بە شێوەیەکی رێکوپێک و عەقلانی و تۆکمە دارێژرابێت و کاری بۆ بکرێت. لەبەر ئەوە دەبینین ئاژاوەیەکی بەربڵاو هەیە لە ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، لە سیستمی خوێندندا، هەروەها لە بواری زمان و وەرگێڕان و لە ژیانی رووناکبیریماندا بەگشتی. بۆیە ئەمە بەشێکە لەو قەیران‌و ئاژاوە کوولتوورییەی کە ئێمە تێیدا دەژین، نووسین، لە باشووری کوردستاندا بۆتە بواری کار و پارە و نان پەیدا کردن. ئەمە هەندێک جار دەشێت خراپ بەکار بهێندرێت و بکرێتە کارێک بۆ ئێرتێزاق‌و کاسەلێسی. لە حاڵەتێکی وادا کە ئێمە دەزگایەکی وەرگێڕانمان نییە، بەپێی پلانێک کار بکار و بزانێت چی بۆ کورد

پێویست و گرنگە وەربگێڕدرێ ئەوجار کەسانی پسپۆڕی خۆی بۆ دیاری بکرێ. زۆر جار ئەوەی تەرجومە دکرێت، بەداخەوە دەڵێم، زۆری بەرماوەی وەرگێڕدراوی سەقەتی عەرەبی و فارسین، کە کەسانێک نە فارسی بە باشی دەزانن نەعەرەبی دەزانن دێن ئەو کارە دەکەن. ئەو شوێنەی بۆ ی‌ڵاوکردنەوە بۆیان دەبەن، زۆربەیان نایدەن بە دوو کەسی پسپۆڕ و شارەزا، کە بە شێوازی وەرگێرانەکە و زمانەکەیدا بچێتەوە و لەگەڵ ئەسڵەکەیدا بەراوردی بکات، بۆ ئەوەی بزاندرێت کە ئەو کەسە چۆن کارەکەی کردووە، چی خۆی لێ زیاتر کردووە، یان نەیتوانیوە وەری بگێڕێ. لەبەرئەوە بە شێوەیەکی سەقەت‌و ناپوخت دەخرێتە بازاڕەوە، تەنیا بۆ ئەوەی بڵێن فڵان ناوەندو شوێن ئەمساڵ ١٠یان ٢٠ کتێبیان بڵاوکردۆتەوە. لەبەرئەوە بە راستی ئەمە خەتەرە بۆ سەر زمانی کوردی. من دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم سەتا هەشتای ئەو شتانەی لەو دە ساڵەی دواییدا کراون بە کوردی و من بینیومن، ئەوە دەبن بسوتێنرێن، بۆ ئەوە دەبن کە نەهێڵدرێت لە کتێبخانەکاندا بمێنن دەست گەنجی کورد بکەون، بۆ ئەوەی بە لای کەمەوە ئەو زمانە پاراوەی لە ماڵەوە یان لە مەکتەب فێری بوون، لە رێگای ئەو وەرگێرانە سەقەتانەوە، تێک نەچێت‌و کوردییەکەیان بەرەو خراپ بوون نەڕوات. ئەو دیاردەیە ، بەشێکە لەو ئاژاوەیەی کە لە ژیانی ئێمەدا هەیە.

*** دوکتور دەبینین هەر لەو باسی وەرگێڕانەدا دیارە فێربوونی زمانێک وەکوو شێوەی ئاخاوتنی قسەکردنی رۆژانە لەگەڵ ئەوەی تۆ بە شێوەیەکی تۆکمەیی و زانستی بخوێنی و فێربی جیاوازییەکی زۆری هەیە. بەڵام لە کاری وەرگێڕاندا کوردی باشووری کوردستان ئێستا دێن زمانی فارسی وەردەگێڕن، ئەوە ئێستا بۆتە قەیرانێکی زۆر، بەراستی خەسار هەڵگرە کە یەکجار زەربەی لە زمانی کوردی**

**دەدات، رەنگە ئێستا کاریگەرییەکانی دەرنەکەوێت، بەڵام لە درێژخایەندا کتێبخانەی کوردی تووشیماڵوێرانی بکا، برادەر رۆیشتووە لەودیو تەنیا کرێکاریی کردووە ئێستا هاتۆتەوە وەرگێران دەکات، بۆ نموونە دەقی وەرگێڕاوە کە فارس دەڵێ (دلم شور می زنه) ئەو دەڵێ (دڵم سوێر لێ دەدات) نەگەڕاوە کورد چی پێ دەڵێ، دەڵێ (دڵە کوتەمە) دیارە زۆر شتی لە و چەشنە لە ئارادا هەیە. ئەمە لە درێژخایەندا بە رای جەنابت دەبێ حکوومەت بێ، ناوەندی بڕیاردان بێت کە ئەوانە دەست نیشانکەن، کە کێ وەربگێڕێ چی وەربگێڕدرێت، یان پێداچوونەوە بکرێ و بڕیارێک بدرێت لەو ناوەندانە کە ئەمە بە کەڵکی کتێبخانەی کوردی نایەت؟**

- کاتی خۆی کاک کەریم حیسامی روحی شاد بێ دەیگوت: کوردی عێراق بە تەیارەش بەسەر ئێراندا تێپەڕن پێیان وایە فارسی دەزانن.

راستییەکەی ئینسان ئەگەر شەرم لە خۆی نەکات شەرم لە هیچ کەس و شتێکی دی ناکات، کە شەرم لە ناوی خۆی، کەسایەتیی خۆی نەکات شەرم لە هیچ کەسێکی تر ناکات، لەبەر ئەوە کەسێک فارسی و عەرەبی نازانێت، دێت تەنیا بۆ ئەوەی تۆزێک پارەی دەستکەوێ کارێکی وا دەکات، ئەمە ئەوپەڕی بێ شەرمییە، ئەمە تەنیا خیانەتێک نییە لە نووسین و تەرجومەکردن، لە نەتەوەکەی و لە خۆی، بەڵکو بێ شەرمی و رووهەڵماڵراوییشە. من پێت دەڵێم هەموو ئەو کارانە بۆ پارە دەکرێت، پارەکەش سەدی نەوەد و پێنجی لە حکوومەتەوەیە. دەبێ سنوورێک بۆ ئەو کارانە دابنرێت، دەرفەت برەخسێنە با سەرمایەداریی چاپ بڕیار بدات، بازاڕ بڕیار بدات کام کتێب باشە و کام کتێب خراپە، کتێبێک برەوی هەیە خۆی خۆی دەناسێنێ. ئێمە تا ئێستا بە عەقڵییەتی کۆن پێمان وایە کە کتێب چاپکردن کارێکی پیرۆزە و زمانەکەمان دەپارێزێت. رەنگە پێش دە ساڵ، بیست ساڵ، چل ساڵ و زیاتر، ئەو بۆچوونە راست بووبێت. بەڵام ئێستا ئەم جۆرە کتێب و بڵاوکراوانە زمانەکەمان دەکوژن، ئەوەی بەعس و ئێران نەیانتوانی کولتوور و زمانی ئێمە تێک بدەن، تێکی بشکێنن، ئێستا خۆمان لە

ڕێگەی ئەو وەرگێڕان‌و نووسینە سەقەت و پڕهەڵە و نابەرپرسانەوە زمانەکەمان تێک دەشکێنین. ئەمە دەبێ بە دیسیپلین بکرێ، دەبێ مەرجی بۆ دابنرێت، دەبێ سانسۆری زمانی هەبێت، من دژی سانسۆری فکریم، بەڵام دەبێ سانسۆرێکی زمان هەبێت کە ڕێگە نەدات، ئەو ئاژاوە و بێ سەرەوبەرییە دروست ببێت. ئەو کاتە کەسێک کە بە تەیارە بەسەر ئێراندا تێپەڕیوە، یان بۆ کرێکاری چووە، یاخود خۆی لە ئێران ژیاوە و تۆزە فارسییەک فێر بووە، جورئەت ناکا، پەنا بۆ ئەو کارە بەرێت. کەسێکی سوێدی دەچێتە بریتانیا باشترین ئینگلیزی فێر دەبێ، بەڵام نایە کتێب تەرجومە بکات، چونکو کاری ئەو نییە.. ئەگەر بیکات دەبێ فڕێیی بدات، چونکە شوێنێک نییە بۆی چاپ بکات. خەڵک هەیە، لیژنە هەیە، پسپۆڕ هەیە بە تەرجومەکەدا دەچێتەوە، ئەگەر کابرا شارەزا نەبێت لە وەرگێڕاندا، بەدیقەت و دەستپاک نەبێت، بۆی بڵاو ناکەنەوە. چونکە لەوێ پارەیەکی مفت لە خەزێنەی حکوومەتەوە، کە موڵکی میللەتە، ناخرێتە بەردەستی کابرا. لەوێ پەخشخانەی ئەهلی و کەسانی پسپۆڕ و بازاڕ بڕیار دەدەن، کە ئەو کتێبە باشە یان نا، هەر پەخشخانەیەک چوار کتێبی خراپ بڵاو بکاتەوە، یان بە بەڵگەوە دوو وتاری خراپ، لەبارەی بڵاوکراوەکانی بنووسرێن، ڕیسوا دەبێت وِ دادەڕووخێ. بۆیە کابرا بە ناچاری ناوەند، یان پەخشخانەکەی دادەخات. کەسیش نییە کارێکی بازرگانی بکات و کار بۆ ئەوە بکات کە دابڕووخێ و شکست بێنێ. لەبەرئەوە دەبێ لە کوردستاندا، وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی کتێب بەگشتی، پرینسیپی نوێی بۆ دابنرێت. بۆ ئەوەی کاری باش لە کاری خراپ جیا بکرێتەوە. کاری باش پاداشت بکرێت، کاری خراپیش بخرێتە تەنەکەی خۆڵەوە، کابرا جارێک تەرجومەی خراپ دەکات، دووجار دەیکات. ئەگەر بۆی بڵاونەکرایەوە سەرەنجام وازدێنێت دەچێت ئیشێکی دیکە دەکات. ڕاستییەکەی تۆ تاوان بەرامبەر ئینسانێک دەکەی کە فارسی نازانێ دێت لە فارسییەوە وەرگێڕان دەکا و کتێبەکەی بۆ بڵاو دەکەیتەوە. تۆ ئەو وەهم و خەیاڵەی لەلا دروست دەکەی کە کابرا تەرجومانە و دەتوانێ لە فارسییەوە تەرجومە بکات، تۆ ئەو ئینسانەت کوشت، دەرفەتت پێ نەدا، ڕێگای ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. ڕەنگە ئەو کەسە

له بواریکی دیکەدا زیرەک بیت، زۆر پیش بکەویت و داهینان بکات. پیگەیەکی گرنگتر بەدەست بخات، له رووی ئابوورییەوە قازانجی پتر بکات. تو لەو شوینە هەلەیە دەیهیلیتەوە و بۆ خۆیشی تووشی بەدبەختی دەبیت.

*** دوکتور لایەنیکی دیکەش لەسەر زمان رەنگە ئیمە بە شیوەیەکی ئاسایی‌و سەرەکی چاوی لی بکەین، بەلام رۆژانە خەلک بەردەوام، تابلۆی سەر شەقامەکان‌و بازاڕ و کوچە و کۆلانەکان دەبینن، کابرا بە عەرەبی فکری کردۆتەوەو بە کوردی نووسیویە، دەلی فرۆکەخانەی هەولیری نیودەولەتی روون نییە، فرۆکەخانەکە نیودەولەتییە یان هەولیر؟ یا دەلی سەروبیی حاجی قادر، کولیرە بەرۆنی حەسەن زیرەک، نموونەیەکی زۆر کەمن لەو شتانە کە رۆژانە ئیمە بە ئاسایی دەیانبینین، بەلام زۆر شوین دادەنین لەسەر بیر و باوەری خەلک، تەواوی تابلۆکانی شاری سلیمانی و هەولیر ببینە یەک تابلۆ بەرچاو ناکەوی نووسرابیت پیشانگا، هەمووی نووسراوە پیشانگا، واتە ئەو هەلانە کە بینە ناو کولتوور و بازاڕ و شەقام و ئەندیشەی تۆوە، لە دریژخایەندا، زەربە لە زمان دەدەن. جەنابت ئەم رەوشە چۆن دەبینی؟**

- راستیەکەی ئەمە تەنیا بەشیک نییە لەو ئاژاوە و بی سەرەوبەرەی و بی خاوەنی ئەم ولاتە، کە کەس بە مانا فراوان‌و کونکریتیەکەی، خۆی بە خاوەنی نازانیت. تەنیا بەشیک نییە لەوە بەلکوو ئەوپەڕی بی زەوقی پیشان دەدا لە کۆمەلی ئیمەدا. ئەوە پیشان دەدا کە هەموومان، بە ئەندازەیەک بی زەوقی لەناوماندا بلاو بۆتەوە، کە ئەم شتانە ئازارمان نادەن و دوو کەسمان هان نادەن، بچین چەند تابلۆیەکییان دابگرین و بیخەینە ژیر پیوە. لە هەر ولاتیکی دنیادا شوینی تایبەت هەیە، پاریزگا یان شارەوانی، کە چاودیری و سەرپەرشتی و کونترۆلی ئەو کارە دەکەن. بەلام زۆر بە داخەوە دەلیم، لای خۆمان، ئەم دوو دەزگایە لەبەر کاری تر و لەبەر کەمتەرخەمیان، لەبەر ئەوەی کە وەکوو هەموومان بەو بی زەوقیە راهاتوون، نایەنە دەنگ و هیچ ریوشوینیک ناگرنە بەر، دەنا مرۆڤ تەنانەت بۆی نییە بە ئارەزووی خۆی هەر ناویکی بوی بۆ پیشانگاکەی هەلبژیری،

یانی چی بۆ نموونه پێڵاوی نالی، بۆ نالی پێڵاو فرۆش بوو؟ بۆ نموونه دەڵێم بەرگدرووی مەولەوی، مەولەوی بەرگدروو بوو؟ ڕەنگە زۆر لەوە خراپتریش هەبێت، بەڵام ئەمە بەشێکە لەو بێ سەرەوبەرەییە و لەو بێ زەوقییە گشتییە، باوەڕیشم پێ بکە ئەگەر دەسەڵات پلان و هەیبەتێکی هەبێ بە یەک مانگ دەتوانێ هەر هەمووی چارەسەر بکا. لیژنەیەکی تایبەت لە کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ، کۆمەڵێک خەڵکی کوردیزان، هونەرمەند و هتد.... دادەنیشن چاوێک بە هەموو ئەو تابلۆیانەدا دەگێڕنەوە و چارەسەری گونجاویان بۆ دادەنێن. بەڵام بەداخەوە ئاژاوەکە ئەوەندە زۆرە کە هەموو بوارێکی ژیانی ئێمەی گرتۆتەوە.

**ئەنجامدانی: شەریف فەلاح**

**تێبینی: ئەم وتووێژە پێشتر بە دوو بەش و لە بەرنامەی ((رامان)) لە (Tishk TV)وە بڵاو کراوەتەوە. لەکاتی پێداچوونەوە بۆ ئەم چاپە، لێرە و لەوێ، هەندێک وشە زیاد یان بژار کراون، هەندێک رستە و داڕشتنیش ڕێک خراونەتەوە.**

## دەوڵەت بەبێ زمانی رەسمی
## وەک وڵاتی بێ ئاڵا و سنوور وایە

* **زمانی ستاندارد چییە و چۆن پێناسەی دەکەی؟**

– زمانی ستاندارد، بە شێوەی جۆراوجۆر پێناسە دەکرێت. هەندێک بە زمانی دەزگاکانی دەوڵەتی دەزانن، کە خاوەنی فەرهەنگ و دەستووری خۆیەتی، هەندێکی تر بەو زمانەی دادەنێن کە لە رووی رێزمان و دەستوور و رێنووس و وشەسازییەوە رێسای چەسپاوی هەیە. زمانی ستاندارد لە بنەڕەتدا ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەیە کە لە قۆناخێکی مێژوویی ژیانی نەتەوەدا دەردەکەوێت. بە هۆیەوە زمانی نەتەوە، لە زمانێک لە خۆیدا دەگۆڕدرێت بە زمانێک بۆ خۆی، لە زمانی پەیڤینەوە دەبێتە زمانی نووسینیش. بەو جۆرە زمان لە دۆخی پاسیڤیی خۆی دەردەچێت و دەبێتە فاکتەرێکی پێکەوەگرێدانی ئەندامانی نەتەوە و پێکهێنانی هەستی هاوزمانی و هاوکولتووری و هاوچارەنووسیی، لە نێو ئەندامانی نەتەوەدا. ئەو زمانە ئەدەبییە سەرەتا لە ناوچەیەکی وڵاتدا دەردەکەوێت بۆیە تایبەتمەندیی

دیالێکتێک، یان چەند دیالێکتێکی ناوچەکەی دەبێت، بەڵام لە رەوشی بڵاوبوونەوەی بە ناوچەکانی تری وڵاتدا سروشتی دیالێکت لەدەست دەدات و لە رووی دەنگ و واتا و وشەسازییەوە بە دیالێکتەکانی دیکەی زمانەکە متوربە دەبێت، مۆرک و سروشتی گشتیی زمانی نەتەوە دەگرێت. ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە دەشێت دواتر بە بڕیاری دەوڵەت بکرێتە زمانی ستاندارد، یان زمانی دیوانی (رەسمی)ی وڵات، قانوون و دەزگای تایبەت بۆ گەشەپێدان و رێکخستنی رێزمان و یەکخستنی رێسای نووسینی زمانەکە دابندرێن.

*** ئایا کورد خاوەنی زمانی ستانداردە و ئەگەر هەیەتی تایبەتمەندییەکانی چین؟**

– کورد تا ئێستا زمانێکی ستاندارد، یان زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەوتۆی نییە کە لە سەرتاسەری کوردستاندا لە نووسین و خوێندندا بەکار بهێندرێت. ئاشکرایە دابەشکردنی کوردستان و ئەو دۆخە مێژووییە سەختەی سەدان ساڵە کورد تێی کەوتووە هۆکارێکی گرنگی دابەشبوونی زمانی و کولتووریی کورد بوون، بەڵام بە رای من دابەشبوونی زمانی و کولتووری خۆیان بوونەتە هۆکارێکی تری دابەشبوونی نەتەوەیی و سیاسیی کورد. ئەمڕۆ لە سایەی گلۆبالیزم و پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیدا سنووری نێوان وڵاتان درزی گەورەیان تێکەوتووە. راستییەکەی جیاوازیی زمانی و کولتووری و ئەلفوبێی تورکی-لاتینی، نەک سنووری دەوڵەتە داگیرکەرەکان، کوردی باکوور و کوردی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستانیان لە یەکتری دابڕیوە و رێگەیان لە تێکەڵبوونی کولتووری و هاوئاهەنگیی نەتەوەیی گرتووە.

ئاشکرایە لە نووسینی کوردیدا سێ شێوە زمان و دوو جۆرە ئەلفوبێی کوردی و تورکی-لاتینی بەکار دەهێندرێن: کوردیی ناوەڕاست (کە هەندێک بە کوردی خواروو ناوی دەبەن) و کوردی

(کرمانجی)ی باکوور-بادینانی و زازا. بەڵام لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی هەیە کە دوو سەدەیە زمانی نووسین و ئەدەبیاتە. ئەو زمانە ئەدەبییە لەگەڵ دەرکەوتنی خوێندنی مۆدێرن و خوێندەواری لە باشووری کوردستاندا، زۆرتر بڵاو بۆتەوە و بە کردەوەیش رۆڵی تەواوی زمانی ستانداردی گێڕاوە و دەگێڕێت. ئەمڕۆ لە هەر بوارێکی ئەدەبی، فیکری، فەلسەفی، ئابووری، سیاسی، زانین و زانستدا، سەدان بابەتی جۆراوجۆر بەو زمانە ئەدەبییە نووسراون و وەرگێڕدراون. نزیکەی سەدەیەکیشە زمانی رۆژنامەگەری و زمانی بزاڤی ناسیۆنالیستیی کورد و هەر حیزبێکی سیاسیی کوردی و هەر حوکمڕانی و دەسەڵاتێکی کوردی بووە، کە لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا دامەزرێندراون. ئەو زمانە ئەدەبییە بە جۆرێکی سروشتی و لەگەڵ گەشەکردنی ژیانی فیکری و کولتووری و سیاسیی کورددا دەرکەوتووە، گەشەی کردووە و بە کردەوەیش، لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا، رۆڵی زمانی ستانداردی بینیوە و دەبینێت. بۆیە مرۆڤ بە دڵنیاییەوە دەتوانێت بڵێت کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی بەرهەمی خەباتی سیاسی و رووناکبیریی دووسەد ساڵەی کوردە و پوختەی ئەزموونی نەتەوەیی و مێژوویی کورد، لەو زمانەدا قاڵ بوونەتەوە. ئەمڕۆ ئاستی ئەدەبی، فیکری، زانستی، سیاسی و کولتووریی کورد، پێش هەر شتێک، لە زمانە ئەدەبییەکەیدا و لە ئاستی زمانە ئەدەبییەکەیدا خۆیان دەردەخەن.

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، لەبەر ئەو رۆڵە گرنگەی بوویەتی، سنووری هەرێم و دیالێکتەکانی بڕیوە و بە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا بڵاو بۆتەوە. ئەمڕۆ نووسەرانی ناوچەکانی موکریان، سنە، سلێمانی، هەورامان، سۆران، گەرمیان و خانەقین بەو زمانە ئەدەبییە دەنووسن و لە هەر کام لەو ناوچانەدا دەرفەتی

خوێندن بە زمانی کوردی ڕەخسابێت (یان بڕەخسێت) ئەو زمانە لە خوێندندا بەکار دەهێندرێت. ئەم زمانە ئەدەبییە لە ڕەوشی بڵاوبوونەوەیدا بەو ناوچانەدا تەنیا دیالێکتەکانی ئەو ناوچانەی نەهێناوەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بەڵکو خۆی سروشتی دیالێکتی لەدەست داوە و لە ڕووی دەنگ و واتا و وشەسازییەوە، سروشتی گشتیی زمانی کوردی وەرگرتووە، لە هەمان کاتدا بە هەزاران وشە و زاراوەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەوڵەمەند بووە. بۆیە هەموو نیشانە و تایبەتمەندییەکانی زمانی ستانداردی پێوە دیارە.

*** ئایا پێویستمان بە زمانی ستاندار هەیە و چۆن دێتە ئاراوە؟**

– گەلی کورد لە باشووری کوردستاندا، بە دڵنیاییەوە پێویستی بە زمانێکی ستاندارد هەیە. دەوڵەتی بێ زمانی ڕەسمی و ستاندارد وەک وڵاتی بێ ئاڵا و سنوور وایە. زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی سەلماندوویەتی کە دەتوانێت، بناخەی دروست و پتەوی ئەو زمانە ستانداردە بێت. کەس ناڵێت ئەو زمانە ئەدەبییە کەموکورتی تێدا نییە، یان هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی تیادا خەمڵیوە کە بۆ زمانێکی ستاندارد گرنگن، بەڵام زمانێکە، لە مێژووی هەشتا ساڵی دواییدا، پیشانی داوە کە زمانێکی زیندوو و پڕبەرهەمە و دینامیکییەتی گەشەکردن و پێشکەوتن و گۆڕانکاری تێدایە و دەتوانێت لێهاتووانە زمانی داهاتوویش بێت. لەمەیش گرنگتر ئایا مەرجە زمانی ستاندارد، هەر لە یەکەمین ڕۆژی بەڕەسمی ناساندنییەوە تەواوی پێداویستییەکانی زمانی ستانداردی تێدا کامڵ بووبێت؟ ڕاستییەکەی زمان خۆی هەمیشە لە گۆڕاندایە و پرۆسێسی پێشکەوتن و کامڵبوونی زمان پرۆسێسێکی بەردەوام و ناکۆتایە. زانایانی زمان و زانکۆکان و ئەکادیمیای کوردی و (دەزگای زمانی کوردی، ئەگەر دابمەزرێندرێت) دەتوانن پێکەوە بەشداریی پێشخستن

و کامڵبوونی ئەو زمانە بکەن و ڕەوش و ئاسۆی پێشکەوتنەکەی دیاری بکەن. بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بڕیارێکی سیاسی لەو بارەیەوە بدرێت، چونکە ئەم مەسەلەیە لە ناوەرۆکدا مەسەلەیەکی سیاسییشە. لەمەیش زیاتر ئەمڕۆ باشووری کوردستان، وەک سەرۆکی ئەکادیمای کوردی، د. شەفیق قەزاز، دەڵێت (پێناسەی خۆی لەو شێوە حوکمڕانی و پێکهاتە سیاسییەدا دەبینێتەوە کە موخابن لە بەشەکانی تری کوردستانی دابەشکراودا تا ئێستا بەرجەستە نییە. هەر ئەم پێکهاتە سیاسی و حوکمڕانەشە کە لە ڕووی واقیعەوە پێویستی بە ڕەسمیکردنی زمان یان شێوەزارێک بۆ سەرانسەری ئەم بەشەی کوردستان تەوزیم دەکات).

زمانی کوردی، کە زمانی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و دەزگاکانیەتی، لە بەرامبەر عەرەبیدا، کە زمانی دەوڵەتی عێراقە، پێناسە (ئایدینتیتی)ی نەتەوەیی کورد دەر دەخات. کورد لە هەرێمی کوردستاندا ئەگەر بە دوو شێوەزمان یان تەنانەت بە دە شێوەزمانیش بنووسێت، تەنیا یەک شێوەزمانی کوردی دەبێت، وەک زمانی ڕەسمیی کورد، لە عێراقدا بناسێندرێت، لەسەر پاسپۆرت، پول و دراوی عێراقی بنووسرێت. پێچەوانەی ئەمە کارێکی نەشیاوە و زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم هەم خۆسووککردنە، هەم هەبوونی زمانی کوردی (لای عەرەبی عێراق و نەیارانی تری کورد) دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بەوەیش بکەم کە ناسینی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی (کوردیی ناوەڕاست) وەک زمانی ستاندارد، بە هیچ جۆرێک بە مانای لاوازکردن، یان یاساخکردنی دیالێکتەکانی دیکە نییە، وەک هەندێک کەس لە نەزانینەوە، یان بە مەبەستی ڕێگرتن لە بەرەسمیکردنی زمانی کوردی لە باشووری کوردستاندا، ئیدیعا دەکەن. بە پێچەوانەوە دیالێکتەکان، کە سامانێکی

گرنگی کولتووریی نەتەوەکەمانن، لە سایەی بوون و گەشەکردنی زمانی ستانداردردا و لە ریگای سیاسەتیکی ژیرانەی زمانییەوە، دەتوانن پاریزراو بن و زەمینەی مانەوە و گەشەکردنی باشتریان بۆ دەستەبەر بکریت. پەرلەمان و حکومەتی هەریمی کوردستان دەتوانن بە قانوون و بریاری تایبەت گەرەنتی ئەو کارە بکەن. هەر دیالیکتیکیش، لە ریی ئەو تیکست و بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەی پیی بەرهەم دەهیندریت، دەتوانیت گەشە بە خوی بدات، ئازادانە توانای خوی پیشان بدات و جیگای خوی لە کومەلدا بکاتەوە، بی ئەوەی شەری زمانی ستاندارد بکات، یان خوی بە ئەلتەرناتیڤ (بەدیل)ی زمانی ستاندارد بزانیت و بەهیزبوونی خوی لە لاوازکردنی زمانی ستانداردردا ببینیت.

*** رات چییە بەرامبەر پرۆگرامی خویندن بە دوو زاری زمانیک و بۆ نەتەوەی کورد لە رووەکانی زانستی و پەروەردەیی و رامیاری و ئاسایشی نەتەوەییەوە ، کە ئیستا وەزارەتی پەروەردە لە پرۆگرامی نویی خویندنی هەریمی کوردستاندا جیبەجیی کردووە؟**

– خویندن و پرۆگرامی خویندن لە هەر ولاتیکدا بەو زمانەیە کە دەولەت و دەزگاکانی دەولەت بەکاری دەهینن. بەلام لە ولاتانی فرەزمان و فرەنەتەوەدا دەشیت زیاتر لە زمانیک لە سیستمی خویندندا بەکار بهیندریت. هەروا لە هەندیک ولاتانی ئەورووپادا، بۆ نموونە لە سوید، مندالانی بیانی بۆیان هەیە هەفتەی سەعاتیک، یان دوو سەعات بە زمانی خۆیان (زمانی دایک) بخوینن. ئەوەی لی دەرچیت خویندن بە زمانی (یان زمانانی) رەسمیی ولاتە.

بەلام ئەوەی لە کوردستان (لە ناوچەی بادینان) دا روو دەدات، هیندەی من ئاگادارېم، هەر ئەوە نییە کە مندالان بە لەهجەی بادینانی بخوینن، بەلکو مەسەلەکە ئەوەیە کە زمانی پەرلەمان و حکومەت و

دەزگاکانی، لە خوێندندا، ڕەت دەکرێتەوە و دژایەتی دەکرێت.

بە ڕای من خوێندن بە لەهجەی بادینانی، یان هەر لەهجەیەکی دیکە، پێش هەر شتێک، مەسەلەیەکی پەروەردەییە و پێویستە پسپۆڕانی بواری پەروەردە بڕیار بدەن کە تا کام پۆل و تەمەن بۆ قوتابیانی ناوچەی بادینان باشترە کە بە لەهجەکەی خۆیان بخوێنن. هەندێک لەو پسپۆڕانە ڕایان وایە کە تا پۆلی سێیەمی سەرەتایی و هەندێکی تریان تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی بە گونجاو دەزانن. بەڵام زۆر گرنگە منداڵانی بادینان، لەپاڵ خوێندن بە دیالێکتەکەیان، بە هەمان ئەو زمانەیش بخوێنن کە منداڵانی کورد لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکووک پێی دەخوێنن. چونکە لە دیدی بەرژەوەندیی نەتەوەییەوە ناکرێت دیالێکتی بادینانی و هیچ دیالێکتێکی دیکەی زمانی کوردی، لە بادینان یان لە هەر ناوچەیەکی باشووری کوردستاندا، ببێتە ئەلتەرناتیڤ (بەدیل)ی زمانی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و دەزگاکانی. هیچ نەتەوە و دەوڵەتێکیش، ڕێگەی نەداوە و ڕێگەیش نادات دیالێکتێکی زمانەکەی، لە ڕووی زمانی حکومەت و دەزگاکانیدا بوەستێتەوە و بیەوێت لە ناوچەیەک جێگای ئەو بگرێتەوە. لە هەر وڵاتێکدا هەوڵی لەو جۆرە درابێت، ئەوا بەو ئامانجە سیاسییە بووە (یان بەو ئەنجامە سیاسییە گەیشتووە) کە خەڵکی سەر بە دیالێکتەکە لە ڕووی زمانی و کولتوورییەوە خۆیان لە نەتەوەکە جیا بکەنەوە و پێناسە (ئایدێنتیتی)ی جیاوازی کولتووری-نەتەوەیی بۆ خۆیان پێک بهێنن. ئەگەر زۆرینەی خەڵکی بادینان خۆیان لە گەلی باشووری کوردستان بە جیاواز دەزانن و دەیانەوێت بە ئاقارێکی جیاواز و سەربەخۆدا بڕۆن، مافی خۆیانە ئەو کارە بکەن. من لە دڵەوە پشتگیرییان دەکەم. ئەگەر نا، هەقە ڕووناکبیران و سیاسەتمەدارانی بادینان عەقلانییانە و لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی نەتەوەییەوە بۆ ئەم مەسەلەیە بڕوانن. ئایا بۆ ناوچەی بادینان باشترە

وەک دورگەیەکی دابڕاوی کولتووری و زمانی بمێنێتەوە، یان لەگەڵ باشووری کوردستاندا تێکەڵ و هاوئاهەنگ بێت؟

* کردنەوەی ناوەندەکانی وەرگێڕان و فەرهەنگ و زاراوەسازی لە کوردستاندا ، تا چەند کاریگەری دەبێت لە هێنانەئارای زمانی ستانداردی کوردی؟ پێت وا نییە دەسەڵاتی کوردی لەم بوارەدا کەمتەرخەمە؟

– کردنەوەی ناوەندی وەرگێڕان و فەرهەنگ و زاراوەسازی مەرج نییە بتوانن کۆمەک بە هێنانەئارای زمانی ستانداردی کوردی بکەن، بە پێچەوانەوە ئەم جۆرە ناوەندانە دەتوانن، لە سایەی نەبوونی سیاسەتێکی زمانی و کولتووریدا، زیانی زۆر بە زمانی کوردی و ژیانی رووناکبیریمان بگەیەنن. مەگەر نابینیت، بۆ نموونە، چ ئاژاوە و بێزەوقییەک لە بواری وەرگێڕان و ژیانی رووناکبیریماندا هەیە؟ پێموایە گرفتەکە لە بنەڕەتدا لەوەوە هاتووە کە سیاسەتێکی زمانی و کولتووریمان نییە. زمان و کولتوور و زۆر شتی دیکەمان، بەرێکەوت و گەمەی قەدەر سپێردراون. کەمتەرخەمی دەسەڵات لێرەوە دێت.

ئەنجامدانی: کامیل عومەر
رۆژنامەی(چاودێر)

## سەرچاوەكان بە بە كوردی

١١- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئینستیتوتی كوردی، پاریس ١٩٨٩

١٢- د.ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی ئەدەبی، بەشی سییەم، ئاسۆ، ژمارە ٤٥١،رۆژی٦-٦-٢٠٠٧

١٣- رەفیق سابیر، ئیمپراتوریای لم، بلاوكراوەی رابوون، سوید ١٩٩٨، چاپ و پەخشی سەردەم، سلیمانی٢٠٠٣

١٤- رەفیق سابیر،كولتوور و ناسیونالیزم، رابوون، سوید ٢٠٠٣ ، چاپی دووەم، چاپ و پەخشی سەردەم، سلیمانی٢٠٠٣

١٥ د.عیزەدین مستەفا رەسوول، زمانی ئەدەبی یەكگرتووی كوردی، بەغدا ١٩٧٠

١٦- فەرهاد شاكەلی، زمان و ئەلفوبیی ستانداردی كوردی لە روانگەیەكی میژوویی و زانستییەوە، رۆژنامەی ئاسۆ، ژ. ٤٣٨، رۆژی ٢٢-٥-٢٠٠٧

١٧ - م. ئە. حەسرەتیان، یاسا دەستوورییەكانی توركیا و كورد لە سەردەمی نویدا، وەرگیرانی لە رووسییەوە د. دلیر ئەحمەد، بلاوكراوەی مەلبەندی كوردۆلوجی لە هەریمی كوردستان ٢٠٠٧

### سەرچاوەكان بە سویدی:

1 - Benedict Anderson, Den föreställda gemenskapen, Översättning: Sven-Erik Torhell, Daidelos, Göteborg 1993, s.78

2- Hug Ryden, Dick Widing, Språk orientering, Sverige, s. 56

3- Ingmar Söhrman, Språk, nationer och andra farligheter, ARENA, 1997

4- Jasenka Trakt, Språk och statbildning, multietniska, Nr 24-25, aug.1999

5- Johanna Barodal & Nils Jörgensen, Nordiska Våra Språk förr och nu,Lund, 1997

6- Karl Popper, Det Öppna samhället och dess fiender, , Del 2, Översättning av Bo Ekström, Akademilitteratur, Stockholm 1981, s.58

7- Michael Norberg, Asiens historia från forntiden till 1914, Natur och kultur, Stockholm 1971

8- Tore Jonson, Språket och historian, Norstedts, Falun 1997

9- Tove Skutnabb -Kangas, Minoritet, språk och rasism, Sverige 1979

10-Öyvind Österud, vad är nationalism, Stockholm 1997